# شارستانیەتی کۆیە لە مێژوودا



کازم عومەر دەباغ





* ناوی کتێب: شارستانییەتی کۆیە لە مێژوودا.

* نووسەر: کازم عومەر دەباغ.

* بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود .

* نەخشەسازی: عیسام موحسین.

* هەڵەچن: نووسەر.

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

* چاپخانە: چاپخانەی تاران.

* چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠٢٠ز - ٢٧٢٠ کوردی.

* نرخ: (٣٠٠٠) دینار.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکانی هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٦١٩)ی ساڵی ٢٠٢٠ز پێدراوە.

## پێشەکی

ئاشکرایە کە رۆژگار زۆر بە خێرایی گوزەر دەکات تەمەن لەگەڵ خۆی دەباو یادگاری و سەروەریەکان بۆ نەوەکانی دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت بۆ ئەوەی ئەوانیش بە ئەمانەتەوە بێ نووسنەوە دوور لەکاریگەری لایەنە سیاسیەکان.

شاری کۆیە خاوەنی خەرمانێکە لە سەروەری و شانازی خودا لەهەرشتێکی جوان کە لەسروشت دا هەیە بەشی شێری بەم شارە خنجیلانە بەخشیوە.

لە شاخی رەنگاو رەنگ باواجی و هەیبەت سولتانی هەیە لە گوڵی جوان حاجیلە و مەندیلان و وەنەوشەی هەیە لە سەرچاوەی ئاو حەمامۆک و زێ ی بچوکی هەیە لە هاوینە هەوار کۆسار و ئۆمەر خوچان و چنارۆک و حەمامۆکی هەیە لەرەزو باخ شیوی رەزانی هەیە لەخەبات وقوربانی گۆرستانی شەهیدانی هەیە لەزانا مەلای گەورەی هەیە لە سەرۆک مام جەلالی هەیە لە بیرمەند مەسعود جەلیزادەی هەیە لەشاعیر حاجی و عاصی و عەودال و ئەختەرو راجی هەیە لەسرودی نیشمانی ئەی رەقیبی دڵداری هەیە هەڵگری مەشخەلی شۆرشی نوێ بوو لەم پێناوەدا بەسەدەها رۆلەی بەخشی بەدەیەها قارەمانی ئەم شارە لە زیندانەکانی بەغداو موسل لە سێدارەدران.

شاری کۆیە لە دێر زەمانەوە شاری پێکەوە ژیان و یەکتر قبولکردن بووە لەم شارە هەموو ئایین زاکانی لێبووە وەک مسولمان، دیان، جولەکە،وەک برا پێکەوە ژیاون رێزیان لە شوێنە پیرۆزەکانی یەکتر گرتووە و بەشداری بۆنە ئایینیەکانی یەکتریان کردووە لەخۆشی و ناخۆشی یەکان هاوکاری یەکتربوون لە دوای هێرشی تیرۆرستی داعش بۆ سەرشاری شەنگال لە ٢٠١٤/٨/٣ ژمارەیەکی زۆر لەخێزانی برا ئێزیدییەکان ئاوارە بوون روویان لە شاری کۆیە کرد زۆر بەرێزەوە پێشوازیان لێکراو دەستی یارمەتیان بۆ درێژکرا تارادەیەک هەندێک لەخێزانەکان لەناو مزگەوتی مەلا ئەسعەد نیشتەجێ کران ئەم

جۆره هەلوێسته مرۆڤایەتی یە بۆ بەرزی ئاستی رۆشنبیری و زانستی خەلکی شاری کۆیە دەگەرێتەوە.

شاری کۆیە ناوەراستی سێ شاری گەورەی هەرێمی کوردستانە هەولێری پایتەخت،سلێمان پایتەختی رۆشنبیری،کەرکوکی دل و قودسی کوردستان، ئەم شارە دەکەوێتە خوارووی رۆژهەلاتی هەولێر بە دووری نزیکەی ٧٠ کم بەپێ ی ئاماری سالی ٢٠٠٩ ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی ٤٤٩٠٨٧ چوارسەدو چل و نۆ هەزارو هەشتاو حەوت کەس بووە، ناو سەنتەری شار خاوەنی نزیکەی هەشتا شوێنەواری مێژوویی یە کە رەسەنایەتی و کۆنی ئەم شارە دەردەخات بۆیە هەقمە شانازی بەشاری شەهیدان و زانست بکەم.

## زنجیرەی یەکەم

**(شاری کۆیە)**

لە نێوان بەردە ئاشی هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار وەک دیارە کۆیە شارێکی کۆنە لە مێژوو پێشەنگ بووە لەپێش برکێی پێشکەوتن خودای مەزن لەهەر شتێکی جوان کە هەیە لە سروشت بەشێکی بەم شارە بەخشیوە.

ئەگەر پێچێک بدەین بە ناو گەرەک و کۆلانە تەنگە بەرەکانی گەرەکەکانی بایز ئاغا و هەواوان و قەلات و بەفری قەندی ساڵانی کۆتایی پەنجاکان دەرگای هەرماڵێک ئەگەر بخەیتە سەر پشت داستان و رۆمانێک و چیرۆکێکی ناخ هەژێنت بۆ دەگێریتەوە کە گوزارش لە خەبات و قوربانی ئەم شارە دەکەن.

لە پێناو کوردایەتی لە کۆتایی گێرانەوەی هەر رووداو و داستانێک کۆیە شانازی بەوە دەکات کە شەهید و قوربانی یەکانم هێندە بێ شمارە گۆرستانی تایبەتم بە شەهیدان هەیە.

بەڵام بەداخەوە ئەم بەرپرسانەی ئەمرۆ بێ ئەمەک دەرچوون ئەگەر چی پەروەردەی قوتابخانەی کوردایەتی ئەم شارەبوون شاریان لە کەمترین خزمەت گوزاری سەردەم بێ بەش کردووە ئەم شارە کەوتۆتە نێوان دوو بەردە ئاشی دوو حیزبی دەسەڵاتدار کەسیان بەهی خۆی نازانێ لەم ناوە ماڵ وێرانیان کردووەو بژێوی ژیان لەم شارە لەو پەری نەهامەتی دایە.

## زنجیرەی دووەم

شاری کۆیە ئەو شارەی خاوەنی دوو سەرۆک کۆمارو دەیەها سەرکردەی سیاسییە، بەلام بە داخەوە تا ئێستا ئەم شارە بێ میوانخانەیە کاتێ باسی مەغدوریەتی ئەم شارە دەکەی وەلامی بەرامبەرەکانمان ئەوەیە دەلێن با سەرۆک کۆمارەکانی ئەم شارە بۆیان بکردبان و بەئەرکی سەرشانیان هەلسابان.

لەراستیدا وەلامەکانیان لە شوێنی خۆیەتی باوەرتان هەبێ کۆیەی پەنجاکان گەلێک لە ئێستا پێشکەوتووتربوو لە هەموو بوارەکانی ژیان حاجی قادر گەر زیندوو ببێتەوە و چاوی بە شێواندنی جوانی ئەم شارە و شیوی رەزان بکەوێت کەبووە بەشوێنی فرێدانی خۆل و خاشاک دەعوای تۆمار دەکرد لە سەر یەکە یەکەی بەرپرسانی ئەم شارە کۆیەکانیش بەرپرسن لەم هەموو کەم و کوریانەی ئەم شارە دەبوو رۆژی دەنگدان بەرە بەیان نەچووبان بۆ دەنگدان بە کەسانێک کە هیچ ماندوو نەبوون تەنها بۆ ساتێکیش بۆ کوردایەتی یەکێک دەبێ بە خەمخۆری شارێک کە ئازارو ئە شکەنجەی دیبێ لەناو ئەم شارە بەلام بەرپرسەکانی ئەم شارە دەبێ راستی یەکیان لەبەر چاو بێ کە لەدوا رۆژدا مێژوو بەباش باسیان ناکات شتێکی دیکەش هەیە.

پێشینان راستیان گوتووە کە گوتوویانە رۆژان رۆژی لە دوایە رۆژێ دێ تۆپ دەکەوێتەوە ناومەیدانی یاری کردنی کۆیەکان با نەچن بۆ سەر سندوقەکانی دەنگدان .



## زنجیرەی سێیەم

### (کۆیەی جاران)

جاران کۆیە زۆر لە ئێستا پێشکەوتووتربوو لە هەموو بوارەکان شارێکی پیشەسازی بوو هەموو جۆرە کەلوپەلێکی کشتوکالی وەک داس تەورداس بیور پێمەرە خاکە ناس هەو جار گاسن کۆلی ئالیک قەیناغ (مەرەغان)ی لێدروست دەکرا.

جگە لەمە کورتان و زینی ولاخ و لغاوو قەراسەو سەر پارەوی لێدروست دەکرا لە شاری کۆیە خەنجەرو چەقۆ و قیمەکێش دروست دەکرا کارگەی رستنی لێبوو جاجم و بەرمالو خرارو گوریس و کەژوو دەسرازەو تێرکەو تۆر و جواریان دروست دەکرد.

جگە لەمە جل و بەرگ رەنگ دەکرا لە کۆیە هەموو جۆرە پێلاوەک دروستکراوە وەک کالەکی ئاوریشم و یەمەنی و لاستیکە سۆرو سۆل و نەعل و قاپ قاپەی دارو کەلاش. لەم شارە دارتاشی زۆر شارەزای لێ بووە هەموو شتێکیان دروست کردووە لەدار گوێز بە مشاری دەست دار یان شەق دەکرد ئیغدان و مێز و کورسی و لانک و جۆلانەو رەورەوە و شەقەیان دروست دەکرد لەم شارە صفار هەبوو مەنجەل و قاپ و تەشتیان سپی دە کردەوە جاران مەنجەل و قاپ و قاچاغ لە سفر دروست دەکرا دەبوو سالێ دووجار بەهاران و پاییزان هەموو قاپ و مەنجە لەکانمان ببردبا بازار لای مەنجەل سپی کەرەوە سپی بکردباوە ئەگەر نا تەسەمومان دەکرد واتە ژهراوی دەبووین جاران فافۆن و تیڤال نەبوو لە ناوەراستی شەستەکان فافۆن پەیدابوو لە ناوەراستی حەفتاکانیش تیڤال پەیدابوو جگە لەمانە لەم شارە هەموو جۆرە شیرنەمەنیەک دروست دەکرا وەل پاقلاوە شلکێنە لوقمە قازی مەعجون لەبزینە شروب کونجی شەکرلەمەکێک لەم شارە پێش ئەوروپا بیتزا دروست کراوە ئە ستوکی بەگۆشتی و بە هێلکەو کونجی لە لایەن نانەواکان جگە لەمە لە کۆیە لباد بەر مافور فەرەجی کەپەنەک کورەبار فەرو پەستەک دروستکراوە لە کۆیە شێلم بەترش و ترشیات و

تەرەساز و زەیتون خۆش کردن و شەراب و ئارەقی یاواریٚ و شەربەتی مێوژ دروست کراوە.

لەم شارە تەنەکەچی لیٚ بووە کە سۆپەی دارو بۆری و مقارەو ماشەو کەل و پەلی دیکەی وەک مەنجەل و کەندوویان دروست دەکرد لەم شارە چەخماخچی لیٚ بووە هە موو جۆرە چەکێکیان چاک دەکردەوە.

ژنانی ئەم شارە دەست رەنگین بوون کلاویان دروست دەکرد بە هەموو جۆرێک بۆ هەموو ناوچەیەک جگە لەمە گۆریەو پوزەوانەو کلاوی مەرەز و ڤانیلەو لیفکەیان دروست دەکرد ئەمەی گرنگە لە دروستکردنی ئەم کەل و پەلانە سودیان لە بەرهەمی خۆ مالی وەردەگرت.

جاران پێش سالآنی شەست رەواندوز و شەقلاوە سەر بەکۆیە بوون لەدوای شۆرشی ١٩٥٨ وردە وردە ئەم شوێنانە یان لێکردەوە هەتا سالانی حەفتاش لە ناوچەی وەرتیٚ و رانیەو قەلادزیٚ دەهاتنە کۆیە پێداویستی یە کانیان دابین دەکرد لە کۆیە قەلتارەو سەبەتەو قەفەزو سەوە شیرو نانديٚن پێتەرازوو دروست دەکرا هەر شتێک مرۆڤ پێویستی پیٚ ی هەبوایە لەم شارە دروست دەکرا بەڵام بەداخەوە لە دوای راپەرین بەرپرسان سیمای ئەم شارەیان ژاکاند لە زنجیرەکانی دیکە باسی دەکەین.

## زنجیرەی چوارەم

**(شاری کۆیەی جاران)**

هاوشارو هاوڕێیانم باسی پێگەی شاری کۆیەمان کرد لەرووی پیشەسازی هەندێک پیشەسازی دیکەی ئەم شارە دەخەینە بەرچاو لەم شارە دەباخانان هەبوو خوری و پێستە و ریخۆلەی تێدا ئامادە دەکرا و هەندێک لەم خوری و مووە لەناو کۆیە وەک کەرستەی خاو بەکار دەهات لەلایەن دیانەکانی کۆیە بەخەرەک دەیان رست جاجم بەرمال خرار جوار شەلتە لیفکەو دەسرازەی لانکیان لێ دروست دەکرد ئەوەی زیادبووایە بە سە یارەی لۆری رەوانەی موسل دەکرا ئێستاش بەشێک لە دەباخانانی ئێمە ماوە بەشی زۆری بەبەر جادەکەوت.

لەم شارە کەرەستەی خانوو دروستکردن هەبوو وەک گەچ، گلەسۆر، بۆ دروست کردنی خشت دار سپیندار کۆلەگە نێر گە پشتیوانی پشت دەرگا قامیش و چیغ بۆ دارە رێی خانوو قسل لە بۆ سواغکردنی سەر زەوی و دروستکردنی نۆین و ئاوەرۆ بە کاریان دەهێنا.

دەرگاو پەنجەرە لەدار دروست دەکرا لای دارتاش دەرگاکان کێلونیان نەبوو پشک دەدرا کلیلی داری پێوە بوو کە دەچوینە دەرەوە دەیان گوت دەرگاکە پشکدە ورەپێشیکە دەرگا دارەکان دوو دەری بوون بزمار رێژ دەکرا بە بزماری سەرپان بۆ دیکۆر دەرگاکان لەسەر سیو سیوە دا دەنرا بۆ ئەوەی عەیاری تێک نەچێ و ئەو دارەی کە دەکەوێتە سەر زەوی نەرزی سیو سیوە پارچە لاستیک یان قایشەکی بەهێزبوو لەناو قۆلتێک دادەنرا داری دەرگاکەی لە سەر دەسورا جاری واهەبوو دارەکە لە سەر قایشە کە لادەچوو دەرگاکە خراپ دەبوو یا شەت دەبوو دەیان گوت دەرگاکە لە رێسمە چووە.

ئەم وشانە هەر نەماون لە جیاتی تانکی ئاو هەموو ماڵێک حەوزێکی لەناوەراستی حەوشە هەبوو بەلوعەیەکی تێدەخرا لە جیاتی دەست شۆر دەست و چاومان لەوێ دەشوشت.

جگە لەمە جاران سخان و گیزەر نەبوو حەمامیا دروست دەکرد بەدار گەرمیان دەکرد مەنجەلێکی بەقوەتیان دەخستە ژێرزەوی حەمام و سەرەکەیان بەقسل دادە پۆشی چونکە چیمەنتۆ نەبوو حەمامی جاران جگە لەوەی کە ئاوەکەی گەرم دەبوو ئەرزەکەشی گەرم دەبوو پێیان دەگوت حەمامی جەهەنەمی.

جاران بەشی زۆری سەقفی ژوورەکان گونبەت بوون وەستای بەنای زۆر باش هەبوون ئە گەر جی نەیان خوێندبوو لە هیچ شوێنێکی بیناسا زی وەک حمدامین وەستا شاکر، وەستا عەبدە، وەستا رشید حاجی عبود، وەستا عبدالله کوری، وەستا بەکری حاجی عبدالله، وەستا فتحی کاکە شێخ صالح، وەستا حوێز، وەستا سمایل، وەستا خورشید حمید، وەستا علی اغا وەستا حەمەرەش بە راستی بەنابوون بۆ دروستکردنی تەلارسازی.

هەموو دەرگایەکی حەوشە لە جیاتی جەرەس چەکوچەکی ئاسنی پێوەبوو کەمیوان دەهات بەم چەکوچە لە دەرگای دەدا هەر مالە دەنگی دەرگای خۆی دەزانی هە موو دەرگایەک پشتی هەبوو شەوان بەکاریان دەهێنا بۆ توندو تۆلی پشتی هەبوو لەئاسن دروست کرابوو هەش بوو دار شەوان دەدرایە پشت دەرگا.





## زنجیرەی پێنجەم

### (کۆیەی جاران)

لەزنجیرەی پێشوو باسی وەستای بەنامان کرد لەم شارە شوێنەواری زۆر سەرنج راکێشەری تێدایە ژمارەی شوێنەوارەکانی کە لەم شارە هەیە نزیکەی سەدو هەشتا شوێنەواری لێ یە خانی گەورە خانی قادری یاسین لەشوێنەوارە کۆنەکانن کە بە مەلکایەتی هی مالی تاهیر چەلەبی و قادری یاسینە بەڵام بەناوی خوالێخۆشبوو قادری یاسین ناسراوە چونکە ئەو ئیدارەی دەکرد بەداخەوە ئەم سال کراوە بەریزە دوکان سیمای شوێنەواری پێوە نەماوە.

خانی مەحمود ئاغا لەناو بازاری کۆیەیە لەسەر دەرگاکەی مێژووی دروست کردنەکەی لەسەر نوسراوە کە دەگەرێتەوە بۆ سالی١٨٦٠/زایینی هاوشێوەی کەمە لەناوچەکە رووبەرەکەی ١٣٠٠/مەتر چوارگۆشەیە بەداخەوە بەرەو لە ناوچوون و رووخان دەچێ دەستگا پەیوەندارەکانی کۆیە هیچ بایەخ بەم شوێنەوارانە نادات رابردووی پێشکەوتنی میللەتان بە شوێنەوارەکانیان پێوانە دەکرێت.

بەڵام بەرپرسەکانی کۆیە لە دوای راپەرینەوە هەموو شوێنەوارە رەنگین و جوانەکانی ئەم شارەیا ن لەناوبرد لەجیاتی پاراستنی. لەکۆیە چوار حەمامی زۆر دەگمەن هەبوون حەمامی پیسکان حەمامی حەسەن ئاغا و حەمامی ناوەند و حەمامی جمهوری بەندە خۆم لە هەموو حەمامەکان شوشتووە باوەرتان هەبێ گەورەترین تاوانە تێکدانی کراون بەگەراج و بازارو خانووبەرە

حەمامێکی دیکەش هەبوو بەناوی حەمام ئاسۆ ئەویش تێکدراوە بووە بە اسواق لەسنوری کۆیە نزیکەی ١٨٠/شوێنەواری لێ یە لەناوشاری کۆیە زۆر خانووی شوێنەواری لێ یە هەمووی بەرەو رمان و لەناوچوون دەچێ لەسایەی بەرپرسانی دوای راپەرین تەنها ئەوانەی خەریکی فلیم دەرکردنن دێنە ناو شوێنەوارەکانی ئەم شارە ئەم شارە.

دوو قەیسەریش لەم شارە هەیە کەنموونەیان کەمە جاران شوێنی بازرگانە گەورەکان بوون ئێستا رەواجی نەماوە وەک جاران لەکۆیە قشلەیەکی سەردەمی عوسمانیەکانیش هەیە کۆیە ئێستا بەرەو وێرانە دەچێ هەموو جوانیە مێژوویی یەکانیان شێواند شێواندنی جوانیەکانی ئەم شارە ناشیرین کردنی مێژووی کوردە لەکۆیە لەنزیک بەیتارخانە شوێنێک هەبوو پێیان دەگوت چوارتاقان شوێنی پشودانی ئەم کاروانانەبوو کە دەهاتنە کۆیەو پێیدا تێدەپەرین.





## زنجیرەی شەشەم

لەمەوبەر باسی شوێنەوارەکانی کۆیە مانکرد جگە لەم شوێنانە لەکۆیە چەند تاقێک هەیە لە گەرەکەکان وەک تاقی مالی جەمیل ئاغا لەگەرەکی هەواوان تاقی عەولا بەگ لە گەرەکی قەلات لای دوکانی سۆفی سەلیم تاقی ناوبازار تاقی لای مالی حاجی سابیر لە گەرەکی قەلات پشت مزگەوتی مەحمود ئاغا تاقی مالیَ حەمە اغا بە بەرجا دەکەوت لەتەنیشت تەکیەی تالەبانی بوو تاقەک هەبوو لە پشت مزگەوتی سید جامی بوو ئەویشیان تێک داوە نەماوە سەیرم هات کە چاوم پیَ کەوت نەماوە تاقی نزیک مزگەوتی موفتی گردی مەلا مەحمود بەرانبەر بلدیەی کۆن وەک گردی قالیچائاغای هەولێر بوو لەگەڵ زەوی یەکسان کراوە بووە بە زەوی نیشتەجیَ کردن.

پردێک هەبوو لەشیوی رەزان خوار قوتابخانەی قادریە رێگای گۆرستانی دەروێش خدر تەمەنی دووسەد سال دەبوو بەقسل دروست کرابوو جادەیەکیان لەویَ دروست کردووە بە بۆری چیمەنتۆ ئاوەرۆکەیان بۆ کردووە لەجیاتی ئەوەی جسرێکیان لەسەر دروست بکردباوە جادەکە هەمووی رووچووە جادەکی جۆت سایدیان کردووە لەدەرەوەی کۆیە گوایە خەت سەریعە بەناوی بەرێز خوالێخۆشبوو مام جەلالەوە ناونرابوو هە مووی بووە بە چال و داتەپیوە هیچ سەیارەک ناتوانی پێیدا تێپەرێت هەر بۆیە لەوحەکەی کەناوی خوالێخۆشبووی بەسەرەوە بوو لایان دا.

ماوەی ٢٩/سالە جادەی ناوشاریان پیَ دروست ناکریَ کە درێژی یەکەی ٦٠٠/مەترە جگە لەمانە دووجار پارە بۆ دروستکردنی تونێلی شاخی هەیبەت سولتان دەرچوو بەنیوە چلی بە جێیان هێشت بەملیون دۆلاریان خەرجکرد بۆ نۆژەنکردنەوەی شاخی هەیبەت سولتان هەمووی دارماوە هاولاتی کەبەویَ دا تێدەپەرێت دەبیَ خۆی تەسلیم خودا بکات و وەسیەت بکا بەراستی شار وێرانە.کۆیە سەرچاوەی زانست بووە لەدێر زەمانەوە مەلاو زاناو شاعیرو سیاسەت مەداری

گەورەی لێ پەروەردە بووە وەک جەنابی مەلا عبداللەی جەلیزادەو جەنابی مەلای گەورەی کوری و حاجی قادرو دلدارو سامی عەودال و عەونی شاعیرو مامی گەورە مام جەلالی خوالێخۆشبوو جاران سوختە خانەو حوجرەی فەقێیان هەبوو لە کوردستانی رۆژهەلاتەوە خەلک دەهاتن بۆخوێندن لەشاری کۆیە وەک جامعەبوو، هەندێک پێداویستی خوێندن دابین دەکرا وەک سورخ کە مەرەکەبی ئێستابوو قەلەم قامیش کەدەیان خستە ناو قدوی سورخ لەسەر کاغەز پێیان دەنووس لەکۆیە هەموو ئامێرەکانی هونەرمەندان دروست دەکرا وەک دەف دەهۆل زورنا شمشال نایە پیک و دوزەلە دمبک پیستەی ئەم ئامێرانە لەدەباخانان خۆش دەکرا لەم شارەدەنگ خۆشی زۆر لێ بووە.









## زنجیرەی حەوتەم

هاورێیانی بەرێز لە زنجیرەی پێنجەم ئاماژەم بە خانی خوالێخۆشبوو قادری یاسین کرد ئەم خانە مولکایەتی یەکەی نیوەی هی مالی مام قادری یاسین و مام تۆفیق ی یاسینە نیوەکەی دیکە هی خوالێخۆشبوو تاهیر چەلەبی یە.

برایان لەکۆیە هەندێک پیشەوەری پزیشکی هەبوون کە بەکاری ئێسک شکان و هەر بەستنەوەی هەلساون وەک حاجی حسین شیلەیی وسدیقی شینەو مام سالحی حمد مستەفا و حاجی مامەی سکتانی هەندێک هەبوون دەرمان گیاییان دروست دەکرد بۆ برین و زارکولی وەک نەنکە حەلیمەو یا عەیشێ ی حاجی سالح مەستور و یا جەمیلەی بەکری،باوکم عومەر خەمەد لەدایکی فێرە گرتنەوەی دەرمان بوو بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پێستە لەکۆیە چەندین کەس بەم دەرمانە چابوونەتەوە.

هەندێک دەرمانی سوتاندنیان دروست دەکرد هەندێک هەبوون ناوکی نەخۆشانیان دەهێناوە وەک سدیقی شینە و حاجی باسە وعەزیزی باسە هەندێک پیرەژن هەبوو بۆن و ترسیان لەمندالان دەردەکردو پشکۆیان بەسەردا دەکوژاندەو یا مسیان بەسەردا دەتواندنەوە لەناو مەقری. پیرەژن هەبوو بەکاری مامانی و نەخۆشی ژنان هەلدەستا وەک یا عەیشێ ی کەریمی ساحێبەو یاهەیبەتی دایکی اسماعیلی خەیات و نەنکە حەلیمەم و پور ئەسران و نەنکە عەیشێ ی مام نەجم و سستەر سەبری و سستەر مریەم هتد.

ئەمانەی بەم کارە هەلدەستان بۆ رازیکردنی خودابوو بەخشیشەکی کەمیان دەدانێ جگە لەمانە جاران سالۆنی جوانکاری بۆ ژنان نەبوو چەند پیرەژنێکی قسەخۆش و بەرێز بەم کارەهەلدەستان پێداویستی جوانکاریان دەخستە ناو تورەکەیەکی پەرۆ لەبن کەوش و هەنگریان دادەناو دەچووەنە ئەو مالانەی کە ژنەکانیان جوابیان بۆ دەناردن بەو پیرە ژنانەیان دەگوت دەم و چاوکەر ئەم دەم و

چاوکەرانە دەبوو کاتێک کە دەچنە ماڵەکە پیاوو کوری گەورە لەماڵ نەبن کاتێ دەستی دەکرد بەکاری جوانکاری دەم و چاوکەر ژنی ماڵەکەی دەبردە پەنایەک یا سەربان نەک یەک دیاربێ وەک ئێستا نەبوو پیاو ژن با بۆ سالۆن و چاوەرێشی بکا هەتا بیهێنێتەوە کچ بۆی نەبوو جوانکاری بکات تاشووی دەکرد مەوادەکانی پیرەژنە دەم و چاو کەرەکان بریتی بوون لە سپیاوو داوی دەزی و شەکراوی گیراوەو موو کێشەک و مقەست و ئاوێنەیەکی خری گچکە بەراستی ژنی جاران مەغدور بوون ئەم پارەیەی کە دەدرا بە دەم وچاو کەر بیست فلس بوو ژن دەبوو پارە بگری بیداتە هەقی پێداویستی یەکانی پیاو سالاری هەبوو ژنی جاران دەست رەنگین بوون لیفکە و گۆرەوی و سەلتەو کورەجە و چاکەتی بەلۆکە و کلاویان دروست دەکرد پارەیان پەیدادەکرد خەرجی خۆیان پێ دابین دەکرد.





## زنجیرەی هەشتەم

### (شەوی بەراتێ ی جارانی کۆیە)

جاران چاوەڕێ ی ئەوەبووین شەوی شەو بەرات بێ نوقل و قەسپ و هەلقوم لەهەموو مالێک ئامادە دەکرا شەو دوای نان خواردنی ئێوارە مندالان بە کۆلانان دەگەران کۆمەل کۆمەل لە دەرگای مال بەمالی کۆلانیان دەدا بەدەم گۆرانی شەوی شەو بەراتێ دوو کورو کچتان داتێ کابانێ دەست لەمالێ بگێری بەشی مندالە ورتکان بنێری.

خاوەن مال دەرگای دەکردەوە بەخۆو قاپە نوقل و قەسپی کورد کوژ و لوقوم جاری وا هەبوو هەندێ مال پارەشیان دەدا کە عانەیەک یا دەفلس بوو عانەک چوار فلس بوو ماوەی سێ شەو بەم شێوەیە دەگەراین هەر مندالە کچ کور تورەکەیەکی پێ بوو ئەم شتانەی کە وەری دەگرت لەناوی دادەنا زۆرجار خاوەن مال دەرگای نە دەکردەوە مندالەکان هەموویان لەدەرگاکەیان دەدا خاوەن مالیان ناچار دەکرد دەرگا بکاتەوە زۆرجار بۆتۆلە سەندنەوە لە مندالەکان لەسەربان ستلە



ئاوێکیان پێدا دەکردین دەبوو بەهەراو واق و ویق بەراستی خۆش بوو.

زۆرجار مێر مندالی گەورەش دەهاتنە شەو بەرات پەلاماری کیسەی مندالەکانیان دەداو دەیان فراند شەوێک من و کاک نازمی برام چوینە شەو بەرات لەبن تاقی ماڵی حەمە ئاغا دوو مێر مندالی گەورە پەلاماری کیسەی پر خورماو نوقل و هەلقومیان داو فراندیان ئەم شەوە بەدەست بەتالی گەراینەوە بەڵام باوکم خوا لێ ی خۆشبێ قەرەبووی بۆکردینەوە سەرو دەفلسی پێداین بەراستی شەوانی عومرو بەرات خۆشی خۆی هەبوو ئاسایش بەرقەرار بوو کۆیە چوار گەرەک بوو هەر مندالە لەگەرەکی خۆی شەوبەراتی دەکرد.

## زنجیرەی نۆیەم

### (کۆیەی جاران)

لە زنجیرەی حەوتەم باسی ئەم پیرە ژنانەمان کرد کە بەکاری جوانکاری هەلدەستان تائێستا پارێزگاریان لەناونیشانەکانیان کردووە وەک یاعصمەت یا هەیبەت یاعەیشێ زۆر قسەخۆش و گالتەچی بوون سەرگوزەشتەی خۆشم لەگەل یاهەیبەت هەیە جیرانمان بوو بۆ خۆشیتان دەیگێرمەوە.

جارێک ژنێک هات بۆلای یاهەیبەت بۆ ئەوەی دەم چاوی بۆ بکات من لەسەربان دەرسم دەکرد خانووەکەمان کۆشک بوو بەسەر خانووی مالی یاهەیبەتی دەروانی یاهەیبەت ژنەکەی هێنا بەرهەتاو لەبانی دوای نیوەرۆ بوو یاهەیبەت پەرۆیەکی جلی راخست دەستە باشی یەکی ئاسنجاوی لەسەر دانا دواتر تورەکەی شروشالاتی لەسەرروو کرد ئەوجا لەگەل ژنە سەر بەقورەکە بەرامبەر یەک دانیشتن ئاگام لێبوو یاهەیبەت بەپەرۆکەکی سپیاوی لەرووی ژنە دەدا من لەپێشەوە هەندێک



ورتـکه بەردی گچـکەم ئامـادەکردبوو کـاتێ یـا هەیـبەت دەزی و داوی دەرهێنا لاقەکی خستەبەر خۆی و لاقی چەپەشی درێژ کرد دەستی کرد بەداو پێ داهێنان بەرووی ژنە منیش سەرم بەرزکردەوە لەستارەی بان بەردێکی گچکەم هاویشت بەناو سینیەکە کەوت دەنگی هـات سـەریان بەرزکردەوە هیچیان نەدیت ئەم جارە یاهەیبەت خەریکی داولێدان ببوو بەردێکـی دیـکەم هاویشـت ژنەکەو یـاهەیبەت راچلەکـین ژنەکە بە یاهەیبەتی دەگوت ئەوەچی یە یا هەیبەت بۆ دل نەوایی ژنە دەیگوت کێشکۆکەیە جارەکی دیکە یاهەیبەت دەستی کردەوە بەکار دوو بەردی یەک لە دوا یەکم هاویشت بە یاهەیبەت کەوت زۆرترسا ئاگام لێبوو دەنـگە دەنـگ و فسـکە فسـکیان لـێ پەیـدابوو لەگەل ژنەکە دیـاربوو بەژنەکەی دەگوت داکم هەستە بـابچینە ژووری باسـەرمان نەشـکێنن یاهەیبەت شتەکانی بەخێرایی خر دەکردەوە و ژنەی بەنیوە چلی بردە خوارێ لەبان.

## زنجیرەی دەیەم

(کۆیەی جاران)

لە زنجیرەی حەوتەم باسی هەندێک کەسمان کرد کە بەپیشەی پزیشکی میللی هەڵدەستان و خەلکی باوەری پێیان بوو (نادری کارەباو وەستا صالحی حمد مستەفا)ناوکیان دەهێناوە زۆرجار لە بازار دیومە ناوکیان هێناوەتەوە زەلامەکەیان هەلواسیوە یا بەدرێژبوون دەستی لەسکی داوە

جگە لەمە کەسانێک هەبوون بالوکەو ئیشکە بیرۆیان چاک دەکردەوە دەبو تەنها چوارشەممە بچووبای بۆ چارەسەرکردن دەبوو جۆ یان گورچیلەی حەیوانیان ببردبا لەبن زەوییان دادەنا کە دەرزی بالوکە یا مێخەکەکە نەدەما هیشکە بیرۆکەش بەرۆنی درکەزی چاک دەبۆوە جگە لەمە دەرمانی کەچەلیش هەبوو ئەمانەی بەم کارانە هەڵدەستان (مجید مام عوسمان یا عەیشێ مام نەجم، شێخ کەمال، ئەحمەدی شینە، حاجی مامەی سکتان).

سەرتاشەکان هەموو جۆرە دەرمانێکی میللی یان هەبوو سەرتاشەکان سونەتیشیان دەکرد دەچوونە مالآن بەخۆیان و جانتا شرەکانیان شاگردەکانیان بۆیان هەڵدەگرتن ئەمە ناوی سەرتاشەکانی کۆیەی جارانە خوا بە بەهەشت شادیان بکات.

١- وەستا معروف کامەلا لە گوزەری نەجاران بوو.

٢- وەستا حەمە عەلی مامە ئەمینی مام قادر چاوشین.

٣- کاکە ئەحمەدی ئەسعەدە سور کەناسراوە بە کاکە ئەفەندی لەگەل سامی کوری.

٤- وەستا مەحمودی ئەسعەدەسور.

٥- وەستا ئەحمەدە گچکەل.

٦- مینەی حەمە سەلیم کورێکی لەبەغدا اعدام کرا لە ١٩٧٤ بەناوی فوئاد.

٧- باقی مام سالح.

٨- حەمەی سۆفی عبداللەی حەمامچی.

٩- بەکری حەلاق و زریان اسماعیل و شێرکۆ حەوێز و فاضل حەلاق.

١٠- وەستا عبداللەی رشید فقێ قادری.

١١- وەستا جەمال.

تەنها وەستا بەکر لەژیان ماوە سەرتاشەکان دەچوونە مالان بۆ خەتەنەکردن، منداڵی واهەبوو مێرمنداڵ بوو گەورە بوو سونەتیان دەکرد بەسێ زەلامی بەهێز لە عاردیان دەداو دەیان گرت وەک گیرەی نەجار ئەوجا وەستا تیخی پێدا دەینا ئەمەی زۆر سەرنج راکێشەر بوو یەکیک لەنزیک وەستا رادەوەستا کەدەیبری منداڵەکە یەک بەخۆی دەی هاراند کەسێک لوقمێکی گەورەی لەزاری دەپەست بۆ ئەوەی دەم کوتی بکات دەبوو ئەوکەسەی سونەت دەکرا کراسێکی سپی درێژ لەبەر بکات سێ رۆژ لەماڵ پار بداتەوە.

دوایی وەستای سەرتاش دەهاتەوە پەرۆکەی لێدەکردەوەو تەداوی





وەستا مەحمود حەلاق



جەمال حەلاق

دەكرد زۆرجار لە كۆڵانە تەنگە بەرەكانی كۆیە منداڵ هەلدەهات یاخۆی حەشاردەدا لەترسی سونەتكردن زۆرجار باوكمان دەیان ترساندین دەیان گوت ئەگەر عاقل نەبن سونەتان دەكەینەوە لەترسان بەعاقلی دادەنیشتین دكتۆر سەلاح جەمال سونەتی دەكرد دەیگوت ساواری ناخۆی.

بۆ زانیاری زیاتر مامانەكانی كۆیەش بەرپرس بوون بەكاری سونەتكردنی كچان هەڵدەستان لەم سەردەمە منداڵ هەر زوو سونەت دەكرێت نابێ بەترس وگرفت بۆی.

## زنجیره یانزده

**(کۆیەی جاران)**

لە زنجیرەی رابردوو باسی سەرتاشەکانمانکرد بەردەوام دەبین لەناو هێنانیان.

١٢-وەستا حمد امین، باوکی شەهید محەمەد حەلاق.

١٣-وەستا امیر فتح الله خمچی.

١٤-وەستا عبدالخالق علی.

سەرتاشەکان کەرستەکانیان بریتی بوو لەگویزان و مەکینەیەکی سەرتاشینی ئەلمانی و موسی مارکەی ناسێت و پەشتە مارێک و فلچەیەک و یەک دوو مەقەست ئاوێنەیەکی گەورە لەگەڵ مەسینەو دەست شۆرێ چونکە مغسل نەبوو کتلیەکی گەورەشیان هەبوو ئاویان تێداگەرم دەکرد.

هەق دەستی سەرتاشینی منداڵ نیودرهەم بوو هی گەوران درهەمێک بوو پیاو سەری خۆیان گویزان لێ دەدا سەرتاشەکان کاکۆلیان بۆ منداڵان دەهێشتەوەو سەریان حەفر دەکردن.

وەک ئێستا هەموو سەرتاشێک گلۆتە شەبێکی گەورەی لەسەر مێز هەبوو کە شوێنێکی دەبری شەبی لێ دەدا جاری واهەبوو لەدوو سێ شوێن سەرمان بریندا دەبوو گویزانەکانیان لەناو شوشەی شەباو دادەنا گەلێک کەس سەری پر ئەسپێ و رشک بوو کەچی سەرتاش سەری دەتاشین.

جاران عەیب بوو سەرتاش بگۆری کە سەرتاش دەمرد خەمان دەهاتێ هەندێک سەرتاش هەبوون لەکۆڵانەکان وگوندەکان سەفەری بوون خەلکیان لەسەر تەنەکە دادەنا، ئەوەی سەیرو سەمەرەبوو سەرتاشەکان زۆرجار قسەی زۆر سەیریان لێ دەپرسین و ئێمەش ساوێلکە بووین هەمووشتمان بۆباس دەکردن کور ئەگەر یەکەم جار سەری چاک بکردبایە پرچەکەیان کۆ دەکردەوە بەپارە دەیان کێشا

پارەکەیان دەکردە خێر ئەگەر یەکێک سەری بشکابا یا دەستی بەچەقۆ ببریایە دەیان هێنا بۆلای سەرتاشەکان دەرمانی دەکرد .
لەکۆیە مام قالەی فەقێیانی و خێزانی عەبد جاسم دەرمانی ئیشکە بیرۆکەیان دروست دەکرد مام فەقێ سەعید بالوکەی دەبری باوکی رەحمەتیم دەرمانی نەخۆشی پێستی دەگرتەوە لە نەنکم فێربووبوو نەخۆشەکانیان بێ بەرابەر چاک دەکردەوە.



١- شەهید ئیبراهیم ئەحمەد بەگ.
٢- م. کازم عومەر دەباغ.
٣- خوالێخۆشبوو ئەمیر فەتحوڵلا.

## زنجیرەی دوانزدە

### (پیشەوەرەکانی جارانی کۆیە)

شارە خنجیلانەکەی کۆیە لە رابردوو پیشەوەری جۆراو جۆری زۆر شارەزاو دە ست رەنگینی لێ بووە توانیویانە کەلوپەلی سەردەمیانەی پێویست دروست بکەن بۆ خۆیان و دەوروبەریان وەک شارێکی پیشەسازی ناوبانگی دەرکردووە.

لەم شارە شوێنێک هەیە بەناوی دەباخانان کە جاران بەگەرەکی دەباخانان ناو دەهێنرا لە سالی١٩٦٨ شەقامێک بەناو ئەم گەرەکە داهات لە فولکەی حاجی قادر تا جادەی سەر رەزان واتە جادەی پێش تەکیەی تالەبانی دەباخانان هەموو بوو بەجادە تەنها هەندێک زەوی دەباخانانی ئێمە ماوەتەوە کە ئێستا کراوە بەریزە دوکان دەباخانان بۆ سەردەمی خۆی زۆر گرنگ بووە خوری هەموو ناوچەی بیتوێن و رانیە و حاجی ئۆمەران دەهاتەوە ئەم دەباخانەیە بە باری بارگیرو گا خوریەکانیان بە تۆری دروستکراو لەموو دەهێنا جاران گا بۆ بارکردن بەکار دەهات.

لەم شوێنە هەموو جۆرە پیستەیەک خۆش دەکراو دەکرا بەقایش کەپێلاوو زین و فیشەک دان و قایش و فەروو پێستەی دانیشتنی لێ دروست دەکرا ، جگە لەمە لەدەباخانان ریخەلۆک خۆش دەکرا بۆ داوی ئامێری مۆسیقا قۆچی گامێش و گاو بزنیشیان بۆ دەسکی خەنجەرو چەقۆ ئامادە دەکرد جگە لەمانە خوری لەگەڵ لوا و موو مەرەز لەم شوێنە ئامادە دەکرا بۆ دروست کردنی لباد، جاجم، بەرماڵ، خرار، جوال،شەبەکەی بار وەک گونیە بەکاردەهات.

بۆ دروست کردنی گۆریەو پوزەوانە لەگەڵ فانیلەو پەستەک و کەپەنەک لەگەڵ کورەبار، کلاوی لبادی سەپانان لەگەڵ دەسرازەی لانک کە دیانەکانی کۆیە ئەم خوری و مووانەیان لەدەباخانان دەکری دوای پاکردنەوەو شوشتنەوەی لەشانەیان دەدا و دەیان رست و دەیان کردە داو، دوایی لە خەرەکیان دەداو دەیان کرد بەجاجم و بەرماڵ و پێداویستیەکانی دیکە، مووی بزنە مەرەزیشیان دەکردە رانک و چۆغەر.

دیانەکـــان دەســـتگای خەرەکیـــان لەنـــاو رەزەکـــانی کـــۆیەدا دامەزراندبوو لەباخچەکانی سۆفی قادر باوکی کاک مستەفاو کاک خدر لە نزیک کەونە پرد.

دەباخانـــان پێکهـــاتبوو لەچەنـــد خـــانوێکی گەورە هەر خـــانووەک ساحەیەکـی فراوانـی لەپـێش بـوو بـۆ راوەسـتانی سـەیارەی گەورەو هەرخستنی پێستە بۆ وشک کردنەوە وەک گەراجی کارگەکانی ئەمرۆ دەباخانە بەمولکایەتی بەناوی باوکم وەستا عومەر دەباغ بوو کە مام کەریـم و کـاک مســتەفا و کـاک عبـدالرحمن کـوری کارەکـانی ئەم دەباخانەیان بەرێوەدەبرد.

دەباخانەکانی دیکە هـی حـاجی عبداللـە حـاجی رسـول، فـتح اللـە، حـاجی رسـول، قـادری حـاجی رسـول لەگەڵ عـومەری کـوری، خـدری سابیر لەگەل مستەفا عارەبی برای. هەمووی ئەو شوێنانە بوون بەجادە تەنها هەندێک لەدەباخـانەی ئێمە مـاوە وەک ئامـاژەم پێ کرد کەکراوە بەریزە دوکان.






## زنجیرەی سێنزدە

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران لەکۆیە هەموو جۆرە چەقۆ و تیغ و خەنجەرو شیری دەروێشان دروست دەکرا ئەمانەی بەم کارە هەلدەستان خوالێخۆشبووان:

١- مام سابیری مام حمد.

٢- مام عەبدە مام حمد.

٣- مام محمدی خەنجەرچی.

٤- مام سابیری برای مام محمد، دوایی چووە شاری رانیە.

٥- وەستا بۆرە لەبەرانبەر دەرگای خانی گەورە بوو لەبن تاقە گچکەکەبوو کە دەچووی بۆ چایخانەی مام تەها.

٦- مام قادری خەنجەرچی.

ئەم پیشەوەرانە کورەیان هەبوو بەخەلوز بەڵام بە هەمبانە هەوایان لێدەدا بۆ ئەوەی ئاگرەکە باش داگیرسێ مندال بووین بەلای وەستا بۆرە تێدەپەرین دەمانگوت پفیدە.

چەند کەسێکی دیکەش هەبوون کاتی خۆی خەنجەرچی بوون بەڵام پیشەکەیان گۆری بوو وەک حاجی عبداللە خەنجەرچی کەمرد تەمەنی سەد ساڵ دەبوو جاران خەنجەری دەبانی جەوهەر داری دەسک شوشە زۆر بەناوبانگ و بەنرخ بوو زۆر کەس خەنجەری لەبەر پشت دادەنا دەیان گوت خەنجەر هەلگرتن سونەتە، لەم رۆژگارە ئەم پیشەیە نەماوە لەکاتی دروست کردنی دەسکی خەنجەرو چەقۆ بۆن چەکی هێسک بلاودەبۆوە خەلکی هەراسان دەکرد.

جگە لەخەنجەرچییەکان هەندێک پیشەوەری دیکە هەبوون بەکاری چەخماخ سازی هەڵدەستان هەموو جۆرە چەکێکی سەردەمیان چاک دەکردەوە وەک تفەنگی برنەو وەسەت برنەو تفەنگی ئینگلیزی و پۆلۆنی و سەمینۆف و پەرەشوت و تاپری راو ئەوانەی بەم کارە هەڵدەستان:

وەستا دەروێش رەقیب و وەستا عوسمانی حمد مستەفای مامم لەگەل وەستا ئیحسانی کوری و وەستا نصراللە و هەندێک وەستای دیکە هەبوون تەنەکەچی بوون هەندێک کەل وپەلی پێویستیان دروست دەکرد وەک سۆپەی دارو مقارەو بۆری سۆپەو سولاوک وماشەو کورەی ئاگرو کەندووی ئارد و نان و پریمز و سێری نان و مووکێش و دەرابە چاکردن و دروست کردنی شوژن و چاک کردنەوەی قۆزاخەی چرای لالە و فانۆش و سورەیە لەگەل چاک کردنەوەی چرای لۆکس یا عەنەتریک دروست کردنی ستل و مەنجەل بەهەموو قەبارەیەک بۆ ساوار کولان و بۆ ئاوگەرم کردن دروست کردنی سێ کوچکەی سەر ئاگردان و سێپای بن کوپەی ئاوو شیشەی کەباب و گۆشت دروستکردنی قەندیلە جۆرە چرایەک بوو. دروست کردنی کۆلی ئاوو ئالیکی ئاژەل ئەمانەی ئەم کارەیان دەکرد.

وەستا ئیحسان، وەستا تۆفیق، وەستا رەقیب، وەستا مارف شێخانی بەراستی ئەم پیشەوەرانەی جاران رۆلێکی زۆرگرنگیان







وەستا ئیحسان عوسمان حمد مستەفا

هەبووە بۆ دروستکردنی پێداویستی یەکانی ئەو سەردەمە جگە لەم پیشەوەرانە هەندێک پیشەوەری دیکە هەبوون کەل و پەلیا لەقور دروست دەکرد وەک گۆسکە گۆزە جەرکە شەربە کوپی ئاو قاپی چینی بۆ ماست تەندوری نانەوا بەراستی دەتوانین بلێین کۆیەی جاران شارێکی پیشەسازی بووە.







## زنجرەی چواردە

### لەیادی رەشبگیری یەکەی ١٩٧٩/٤/١١ شاری کۆیە

ئەمرۆ٤١/سال تێدەپەرێت بەسەر رەشبگیری یەکەی شارە بریندارەکەی کۆیە کە بەعسی یە تاوان بارەکان لەم رۆژەدا بەدەیەها رۆلەی کورد پەروەرو خوێن گەرمی شاری کۆیەو تەق تەق و دەورو پشتیان گرت و بە لێدان و ئازاردانەوە لەبەر چاوی خانەوادە و دایک و باوکیان دواتر بەدەست و چاو بە ستراوی رەوانەی ئەمنی هەولێرو کەرکوک کران دوای سێ مانگ لە ئەشکەنجەدان تاک تاک بەرەلا کران ئەمانەی کە بەرەلاکران براکانیان لەژێر لێدان شەهیدبوو بوون کەخەلکی تەق تەق و کانبی بوون

هەندێک لەم گیراوانە دەگێرنەوە کە بەعسی یە خوێن رێژەکان هەموو رێگایەکی ئەشکەنجەدانیان بەرامبەرمان بەکارهێنا هەر لە کێبل ئاوی گەرم کارەبا هەلواسین هەر بۆیە چەند کە سێکمان لێ شەهیدبوو لەوانە:

١- عزیز سعید قادر کانبی.

٢- وشیار عارف خەلکی تەق تەق بوو.

ئەمەش ناوی هەندێک لە گیراوەکانە کە لەبیرم ماوە داوای لێبوردنیش دەکەم لەوانەی کە لەبیرم نەماون:

١- مامۆستا ناظم عمر دەباغ.

٢- محمد عمر دەباغ.

٣- مامۆستا عزیز حەمە قاوەچی.

٤- مامۆستا دلشاد علی امین.

٥- ستار مضمد.

٦- اسود مضمد.

٧- بەهرام رسول خۆشناو.

٨- حمید عەبدە حاجی قارەمان بەرگدروو.

٩- سەرباز مغدید بەلوعە.
١٠- مۆفق خدر عارف.
١١- وەستا عمر حسن خەیات.
١٢- مامۆستا فوئاد کاکە اسود.
١٣- حمید کەمال.
١٤- مامۆستا نامق عبدالله.
١٥- عزیز سعید کانبی لەبن لێدان شەهیدبوو.
١٦- فوئاد تە ق تەقی لەبن لێدان شەهیدبوو.
١٧- حەسۆ نصرالدین کانبی.
١٨- وهاب کێخوا عزیز.
١٩- پۆلا کێخوا عزیز.
٢٠- نیاز کاکە رەش.
٢١- مام خدر چایەچی.
٢٢- کامل عزیز چایەچی.
٢٣- حاجی علی صابر، پەنجەیەکی لەبن تەعزیب لەدەستدا.
٢٤- ئازاد حمید موزەمید.
٢٥-دڵدار کەبابچی.
٢٦- جەمال قادر یاسین.
٢٧- سالار محمود حەلاق.
٢٨- عەبدول رەزاق بەرید.
٢٩- حاجی رەسول.
٣٠- م.جەمال رەشید.
٣١- مامۆستا سەعید عبدالله سامی.

دوای سێ مانگ لەئەشکەنجەدان هەندێک ئازادکران تەنها دووکەس مانەوە بۆ دادگای مجلس قیادە الثورە ئەوانیش:

١- مامۆستا ناظم عمر دەباغ کە ئێستا نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستانە لە کۆماری ئیسلامی ئێران.

٢- مامۆستا سەعید عبداللە سامی ئەم دووە لەئەمنی تایبەتی کەرکوک مانەوە تا ١٩٧٩/٨/١١ سەدام لە کودەتا یەکی سپی بوو بە سەرۆک کۆمار لەشوێن احمد حسن بکر لێبوردنەکی گشتی دەرکرد بۆ هەموو بەندکراوانی سیاسی و ئەوانی دیکە تکایە هەرکەس ناوی بەندکراوەکانی دیکەی لایە با بۆم بنێرێ دەبوو یەکیەتی نیشتمانی کوردستان سالآنە یادی ئەم رەشبگیریەی کۆیەی بکردبایەوە چونکە سەر بەرێکخستنەکانی یەکیەتی بوون بەراستی شاری کۆیە پێشەنگە لەخەبات و قوربانی دان بەڵام لەرووی خزمەتگوزاری شارێکی فەرامۆش کراوە ئەمەش بێ ئەمەکی بەرپرسەکان دەردەخات.



## زنجیرەی پانزدە

### (پیشەوەرەکانی جارانی کۆیە)

هەندێک پیشە بۆکاتی خۆی گرنگی خۆی هەبوو جاران هەتا سەرەتای حەفتاکان ولاخ بەهەموو جۆرەکانی رۆلێکی گرنگیان هەبوو بۆ گواستنەوەو راپەراندنی کاروباری رۆژانە شوێن و رۆلی سەیارەی دەدیت ولاخ ئەوەی کەرێکی هەبوایە وەک ئەوەی وابوو سەیارەیەکی یارس یا تیدەی هەیە ئاشکرایە کەر هێستر ئەسپ بارگین پێویستیان بەکەرستەی وەک کورتان سەر پارو تەنگە کەژو گوریس زین لغاو جرەو هەیە لەکۆیە ئەم کەرستانە دروست دەکران لەلایەن کورتان دروەکان و سەراجەکان لەناو بازاری کۆیە گوزەرێک هەیە بە ناوی گوزەری کورتان درووان باوەرتان هەبێ لەسەرەتای شەستەکان تاحەفتاکان ئەم گوزەری کورتان درووان جمەی دەهات دەبوو سرەی بگری بۆ کورتان کرین لەحاجی ئۆمەران و دۆلی رەواندوز و خۆشناوەتی و بیتوێن و رانیەو قەلادزێ دەهاتنە کۆیە بۆ کورتان و زینی ولاخ کورتان و زینی کۆیە ناوبانگی دەرکردبوو وەک کوشنچی ئەمرۆ بوو لەکورتان درووەکانی کۆیە:

١- وەستا حمدامین.

٢- وەستا بەکری کوری وەستا حمدأمین و عەزاوی مام حمدأمین.

٣- وەستا عبدالله کورتاندروو.

٤- وەستا حسن وەستا جلال و وەستا کەمال وەستا ئەمیر.

٥- وەستا عەزیز کورتاندروو.

٦- وەستا عەزیزی برای وەستا حەسەن.

٧- وەستا رەئوف.

٨- وەستا عوسمان.

٩- وەستا عمر و حاجی حەسەنی کوری.

١٠- وەستا جلال سمایل حەمەخان.

ئەمانە کەرستەی هەموو جۆرە ولاخێکیان دروست دەکرد نرخی کورتان جیاوازبوو بەپێ ی ئەم کەرستانەی کەبۆی بەکار دەهات

هەنـدێک کورتـان لەکەونە بەرو مـافور دروسـت دەکران ئەمانـە گـران بوون نرخـی دەگەیشتە پەنجا دیناری ئەوکات کە بۆ ئەمرۆ دووسـەد دۆلاربوو کورتـان دروو سـەراج پیشـەیەکی گرنگ بوون ئەمەش نـاوی سەراجەکانی کۆیەیە:

١- وەستا رەفیقی سەراج.

٢- وەستا تایەری سەراج.

٣- وەستا رەئوفی سەراج.

٤- وەستا اسماعیل منصور.

ئەمانـە زینـی ئەسـپ و مـایین یـان دروسـت دەکـرد لەگەل لغـاو فیشـەک دان کـیفە دەمـانچە قایشـی پشـت تەغلیفی دەفتەر خدمـە زینـی ولاخ لە کۆیە زۆرگران بوو نرخی دەگەیشتە سەد دینار کە دەکاتە ٤٠٠ /دۆلاری ئەمرۆیـە کەرەسـتەی کورتـان هەر لەکـۆیە دەسـتەبەر دەکـرا سالانە لە وەرزی هاوین کورتان درووەکان پوشێکی زۆریان بۆ دەهات بەولاخ لەدۆلی فەقێیان پوشی کورتان درێژ بوو نرخی بارێک پوش نیو دینـاربوو کورتـان درووەکـان کۆگایـان هەبـوو بـۆ عەمبـارکردنی پـوش عەمبارەکانی پوش لەنزیک خۆیان بـوو بەتـایبەتی لەخـانی گەورە بەلاّم لەم رۆژگارە بەهۆی زۆر بوونی سەیارە رەواج لەسەر ئەم پیشەیە کەم بووە گوزەری کورتان درووەکـان بووە بە کەمالیات فرۆش بەلاّم هەر بەناوی جاران ناو دەبردێت پێ ی دەلّێن گوزەری کورتاندرووان.



## زنجیرەی شانزدە

**(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)**

گەلێک پیشە بۆکاتی خۆی زۆرگرنگ و پێویست بوون لەکۆیە جاران چەند وەستایەکی شارەزا هەبوون کاری رەنگیان دەکرد پێیان دەگوتن خمچی ئەمانە جل و بەرگیان رەنگ دەکرد بەتایبەتی کراس و چارۆگ و عەبای ژنان ئافرەتی رەوەند زۆر کراسی خۆیان خم دەکرد لەکۆیە ئەمانەی بەم کارە هەلدەستان:

١- وەستا فتح الله.

٢- وەستا قادر ئەمانە دوکانیان لەمەیدانێ خوارێ بوو.

٣- وەستا احمد خمچی.

٤- وەستا کاکە شەل ئەمانە دوکانیان لە دەرگای خانی گەورە بوو لەناو دوکانەکانیان دوو سێ حەوزی تێدابوو رەنگاویان تێدا دەگرتەوە پرێمزیان دەخستە بن حەوزەکان بۆ گەرم کردنی رەنگاوەکە دوای دووسەعات جل و بەرگەکانیان دەردەهێنا و هەریان دەخست لەسەر دیوار و رست بۆ وشک کردنەوەی.

جاران خەلکی بژێوی ژیانی خراپ بوو بۆیە کراس و جل و بەرگەکانیان رەنگ دەکردەوە بۆئەوەی نوێبێتەوە نرخی رەنگ کردنەوە ربعە دینارێک بوو کەدەکاتە چوار دۆلاری ئەمرۆ جگە لەمانە داوی خوری و سوفی جۆلایەکانیان رەنگ دەکرد.





# زنجیرەی حەڤدەم

## (پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیەی جاران)

جـاران لە کـۆیە هەمـوو جـۆرە رایەخێـک دروسـت دەکـرا وەک مـافوری کـوردی کە تەون کەر دروسـتیان دەکـرد لەداوی بەنـی خـوری بە پێوانەو قەبـارەی جیاجیـا لەبەر هەبوونی وەسـتای شـارەزا لەدروست کردنی مـافور حکومەت کارگەی مـافور دروسـت کردنـی لەم شـــارە دامەزرانـــد لەحەفتاکـــان بەڵام بەداخەوە لەدوای راپەریـــن لەکارکەوت.

لەم شـارە لبـادی زۆر جـوان و بـاش دروسـت دەکرا لەلایەن لبـاد چییەکـان هەمـوو ماڵێـک رایەخـی لبـادی بەکاردەهێنا لەجیـاتی مـافوری ئەمـرۆ چـونکە لبـاد گەرم و تە ندروسـت بـوو جـاران زەوی ژورەکـان تەرەشوعی هەبوو لبـاد تـارادەیەک بـاش بـوو زۆرکەس هەبـوون کـاری لباد چیەتیان دەکردلەوانە:

١- مەلای لبادچی.
٢- وەسستاکەریمی گولێ.
٣- وەستا جەمالی کەریمی گولێ.
٤- کەمالی کەریمی گولێ.
٥- وەستا قادری مام حسێن.
٦- سۆفی ئاورەحمانی لبادچی.
٧- حمید سۆفی ئاورەحمان.
٨- مجید سۆفی ئاورەحمان.
٩- صمدلباد چی.
١١- علی فقێ صالح.
١٢- بەکر عومەر علی.
١٣- مەلا مەعروف.
١٤- عبدالله سالح.
١٥- عومەر عەباس.
١٦- کەریم عەباس.

ئەم وەستایانە لبادیان لەخوری مەری یەک ساڵە دروست دەکرد بەم جۆرە خوریەیان دەگوت لوا، لبادچی کەلبادی دروست دەکرد لە دوکان پاش نیوەرۆ لەسەرشانی خۆی دادەناو لبادەکەی دەبرد بۆ حەمامی پیسکان لە گەرەکی دەباخانان بوو لبادچی لبادەکەی لەسەر زەوی ناو حەمام رادەخست ئەرزەکە گەرم بوو لبادچی بەدەیەها جار ئەم لبادەی لول دەداو دەیکردەوە بەم کارەیان دەگوت لباد گێران بۆ ئەوەی لبادەکە بچتە باریەک و توندو تۆل بێ لبادچی جگە لەدروست کردنی لباد کورە بار و کەپەنەک و کلاوی لبادی سەپانانیان دروست دەکرد لبادچی نەخشی لەسەر لباد دروست دەکرد لباد رەواجی زۆر بوو ئێستاش بەکاردەهێنرێت لەلایەن ئەم کەسانەی کە نەخۆشی فەقەراتیان هەیە لەسەری دەخەون لبادچی کەلبادی تەواو دەکرد بەسەرشانی دا دەدا بە بازار دەیگەراند دەیگوت یا الله لمەد لمەد نرخی لباد بە پێ ی درێژی و کورتی و پانی و نەقش دەگۆرا نرخی مەترێک لباد ١٥/دینار بوو کەدەکاتە نزیکەی ٢٥/ هەزاری ئەمرۆ بەداخەوە ئەم پیشەیە نەماوە کەرەستەی لباد دروستکردن لەناو دەباخانان دەستەبەر دەکرا.







## زنجیرەی هەژدەم

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

وەک ئاماژەمــان پێکــرد لە ســەرەتا کــۆیەی جــاران هەمــوو پێداویستیەکانی نـاوەوەو دەرەوەی دابین دەکرد ئاسنگەرەکان رۆلێکی بەرچاویـان هەبـوو بـۆ دروسـت کردنـی کەل و پەلـی کشـتوکال و خانووبەرە ئەم کەل و پەلانەیان دروست دەکرد وەک تەور داس بیور پـێمەرە خاکەنـاس گاســن خەرماشــە قـازمە فیشــەقان شــەنە قەینــاغ مەرەغان بژار کۆر سەرەنیا...هتد.

ئەمانـە هەمـوو کەرەسـتە ی زۆر پێویسـت بـوون بـۆ کشـتوکال کشتوکال قەرزاری ئاسنگەرەکانە ئاسنگەرەکانی کۆیە بەهێزی بازووی خۆیـان لـە ئاسـن کەل و پەلیـان دروسـت دەکرد.لەنـاو دوکـان فرنێک هەبوو کە بەدار گەرم دەکرا لە ناوەراستی دوکانەکە دەستگایەکی ئاسن هەبوو دو شـاگردیش بەخۆیـان و چەکوچە سـەرگەورەکانیان بەرامبەر یەک رادەوەستان کاتێ ئاسنەکە لەناو فرن سور دەبۆوە بەماشە وەستا دەیهێنا دەرەوەو لەسەر دەستگا ئاسنەکەی دادەنا شـاگردەکان بەکوتکە ئاسنەکانی دەستیان ئاسنەکەیان پان دەکردەوە وەستا چەند جارێک ئەم پارچە ئاسـنەی دەخسـتە نـاو فرن و دەیـان هێنـا دەرەوە تـا دەیـان کرد بەم کەل و پەلەی مەبەسـتیان بـوو ئاسـنگرەکان بەهەمبـانە کە لەپێست دروست دەکرا فرنەکانیـان پف دەکرد بۆ جۆشـدانی ئـاگری نـاوفرنەکە چەند وەستایەکی ناودار هەبوون.

١- وەستا عەبدەی ئاسنگەر.

٢- وەسـتاعمر بـاوکی حوالێخۆشـبوو مامۆسـتا حەمـە عـەلی پەیکەرتاش.

٣- وەستا سلێمان باوکی خوالێخۆشبوو کیفی سلێمان.

٤- وەستا احمد باوکی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەجید حەداد.

٥- وەسـتا مستەفا بـاوکی حەمیدی بەرید کە دوکـانی لە تەنیشـت محمدی جگەرچی بوو کە بە سەرەنیا بەناوبانگبوو.

٦- وەستا قادری ئاسینگەر باوکی ابوبکر دوکانیان لە گوزەری خوارێ بوو ماڵیشیان لە بەفری قەندی بوو.

دوکانی وەستا عەبدە لەتەنیشت خانی قادر یاسین بوو دوکانی وەستا سلێمان لەنزیک گوزەری نەجاران بوو تەنیشت دەرگای قەیسەری کۆن دوکانی وەستا عمر و کاک عوسمانی برای لە کۆلانەی هەواوان بوو خوار دەرگای قەیسەری نوێ کاتی خۆی حاجی کەریمی ئاسنگەر ئەم کارەی کردووە دیمەنی کارکردن و کوتک بلندکردن و راوەشاندنی شاگرد ئاسنگرەکان زۆر سەرنج راکێش بوو ئاسنگرەکان هەندێک کەل و پەلی قەسابیان دروست دەکرد وەک قیمەکێش تەبەر مەسەد چەقۆ بەداخەوە ئەم پیشەیەش هاوشێوەی پیشەکانی دیکە لەگەڵ دەستگاکانیان نەماون .



## زنجیرەی نۆزدەم

**(پیشەوەرەکانی کۆیە ی جاران)**

جگە لەلبادچی پیشەیەکی دیکەش لەکۆیە هەبوو ئەوانیش پەرەکەربوون کاریان پەرەکردنی لۆکەو خوری و دروستکردنی دۆشەگ و بالیف و لیفە بوو پەرەیان بەئامێرێک دەکرد کە لەدار دروست کرابوو ژێ یەکی پێوە بوو وەستا بەدەسکە دارێک لە ژێ یەکەی دەدا و لۆکەکەی پێ پەرە دەکرد ژێی داری پەرە وەک ژێ ی عود وابوو بەڵام ئەستورتر بوو لەریخەلۆکی حەیوان دروست دەکرا چەندکەسێک بەم کارە هەڵدەستان:

١- حاجی رەئوف.

٢- کاک عبدالرزاق.

٣- حاجی قادر مام حسێن.

٤- مەلای پەرەکەر.

٥- یا بەهیەی دیان.

٦- یاسارێ ی دیان ئەم دوو ژنە مەسیحی یە بەخۆیان و داری پەرە دەچوونە مالان.

٧- عبدالله مستەفا.

٨- عبدالله اسماعیل چاوشین.

دۆشەگ و بالیفیان پەرە دەکرد، پاییزان هەموو خانەوادەیەک لۆکەو سوفی ناو دۆشەگ و بالیفیان پەرە دەکرد بەراستی ژنی جاران ما ندوو بوون بەم دوایی یە مەکینەی کارەبایی بەکار دەهات لەبری ئامێری جاران ئەم پیشەیەش بەرەو نەمان چوو جگە لەم پیشەیە هەندێک ژن هەبوون لەکۆیە لیفکە گۆریەی خوری بلوزو فانیلەی خوری دۆخین کلاوی پیاوان بەهەموو جۆرێک و نەخشێک بە داوی خەیاتەی رەنگاو رەنگ دەسرا زەی منداڵانیان دروست دەکرد دەیان نارده بازار دەیان فرۆشت هەنێک بۆ خۆیان دەیان گێرا لە بازارو دەیان فرۆشت و بژێوی ژیانی خۆیان پێدابین دەکرد.

ئەوەی سەیرو سەمەرە بوو ئەوانەی کلاویان دروست دەکرد لەقوماشی موبرەت دوای تەواوکردنی کلاو دەبوو لەقالب بدرابایە قالب لەگەچ دروست دەکرا هاوشێوەی سەلکی مرۆڤ پێش ئەوەی کلاو بخرێتە سەر قالب دەبوو شەکراوێکی خەست پاشیریان لە قالبە گەچەکە هەلدەسو ئەوجا کلاوەکەیان لە قالبەکە هەڵدەکێشا لەبەر هەتاو دایان دەنا کەوشک دەبۆوە کلاوەکە رەق دەبوو لەهاویندا گەلێک جار شەکراوی کلاوەکە نەرم دەبۆوە سەری کابرای بەخوری دەهێنا نرخی کلاوی باش دوو دینار بوو هەش بوو جەمەدانی و مێزەرو مشکی سەری پیاوانی دەهۆندەوە یا گورینگەیان بۆ تێدەخستن بەراستی ژنی جاران ما ندوو بوون هەندێک ژن هاوشێوەی پیاوان لەکۆیە دوکاندارو بازرگانیان کردووە زۆر مەردانە خەلکیش بەرێزەوە سەیری کردوون لەوانە:

١- حاجی ئامینە.

٢- یا کافیە ی مەلازادەکان.

٣- یا نەزیف.

٤- یا ئامینە.

٥- یا قەدری مام خدر.

٦- یا بەهیە.

٧- یا حە لیم رەزا.

٨- یاخەجیج.

٩- خێزانی سۆفی سەلیم کەناوی یاگولچین بوو.

ئەم دیاردەیە پێشکەوتنی ئەم شارە دەسەلمێنێ وەک باوەر بوون بە ژن لەکۆیە ژن هەبوو نانەوا بوو وەک ژنی حەمە گران لە مالەوە تەندوری کولێرەی هەبوو خۆم نانم لێکریووە یا مەنیج زرۆبی دروست دەکرد تا ئێستا ژنە کۆیی نازانن وەک ئەو دروستی بکەن بەیانیان زوو کاک مستەفای کوری خوا لێیخۆشبێت دەیهێنا بۆ چایخانەکان خەلک دەیان کری هەقمە بلێم ژنی جاران شێرە ژن بوون شتێکی دیکەش

هەیە کە پەیوەندی بە پەرە کەرەکانەوە هەیە کچ کە بە شودەدرا دایکی بوک دەچووە لای پەرە کەر بۆ ئەوەی لێف و دۆشەگی دوو نەفەری و بالیف و سەرینیان بۆ دروست بکات بۆ گیاز. زاواو بوکی ئێستا تاقمی سیسەم دەکرن دۆشەگ و لێفی لۆکە باوی نەماوە ژنی ئێستا بەپێ خەفەکانی جارانی ئێمە رازینین دەی بەخشن لەگەل یادگاری یە خۆشەکانی زەمانی گەنجایەتی هەر دەبێ بلێین لە دەستم چوو بەخوا قەت نایەتەوە.





## زنجیرەی بیستەم

### (هەندێک پیشەوەری دیکەی جارانی کۆیە)

جاران لە شاری کۆیە هەندک پێشەوەر هەبوو کەپێلاویان دروست دەکرد بە هەموو جۆرەکانی بۆ سەرجەم تەمەنەکان یەکێک لەپێلاوە گران بەهاکانی ئەوکات کالەک بوو کە لەپێستی گامێشی خۆشکرا دروست دەکرا سەرەکەی بە ئاوریشم دەچنرا دوایی لەقالبی دار دەدرا بەپێ ی گچکەگە و گەورەی کالەکە کە لە وەستا بە ناو بانگەکانی کالەک

١- باوکم وەستا عمر دەباغ، یەکەم کەس بووە ئەم پیشەیەی کردووە.
٢- وەستا فەتاحی کالەک درووی.
٣- وەستا صادق.
٤- وەستا فتاح مام حمدامین لای باوکم خەلفەبووە لەژیان داماوە.

ئەم جۆرە پێلاوە گران بەهابوو پیاو ماقول و دەولەمەندەکان بەکاریان دەهێنا زۆر بەهێزو خۆراگربوو کێشی سوک بوو تەندروست بوو گەلێک جار ئەم پێلاوە لەلایەن کۆرسی شایی بەکار دەهێنرا، جۆرە پێلاوەکی دیکە لە کۆیە دروست دەکرا پێیان دەگوت یەمەنی زۆر سوک بوو رەنگی سوور بوو پیاوە بەتەمەنەکان بەکاریان دەهێنا لە وەستا باشەکان:

١- حاجی حمد باوکی مامۆستا عمر.
٢- حاجی حمدامین باوکی کاک اکرمی مهندس خزمی ئێمە بوو.

جگە لەمانە جۆرە پێلاوەکی دیکە دروست دەکرا پێیان دەگوت لاستیکە سوورە کە لەقایشێکی سور دروست دەکرا بنی پێلاوەکەش لەتایەی سەیارە دروست دەکرا ئەم جۆرە پێلاوە زۆر باوبوو زۆربەی جوتیارو لادێیەکان لەپێیان دەکردو بەکاریان دەهێنا چونکە بەهێزبوو نەدەدرا قایشەکەیان بەبزمار گچکە لەبنەکەی دەدا منداڵی شاری بۆ یاری کردنی تۆپانێ لە پێیان دەکرد چونکە زۆر بەهێزبوو نەدەدرا لە وەستا باشەکانی ئەم جۆرە پێلاوە.

١- وەستا رەشید.
٢- وەستا رەسول عادیلان.
٣- وەستا عبدالرزاق مام حمدأمین.
٤- وەستا توفیق.
٥- وەستا عبدالله کوری وەستا رشید.
٦- وەستا فتاح مام حمدامین.
٧- مام احمد سەری مەیدان.
٨- حاجی حمدامین.
٩- وەستا حمید، باوکی خوالێخۆشبوو کاک شەوقی.
١٠- وەستا محمد مۆتیَ.
١١- وەستا حەمەد برای سەعید هیتلەر.
١٢- مام حاجی رەشید.
١٣- خەلفە حەوێز.
١٤- وەستا حەمیدی پینەدوز.
١٥- وەستا محمد مام حمدامین.
١٦- وەستا زاهیر برای وەستا فتح الله.
١٧- وەستا مامە.
١٨- مام ئەمین لەگەل کورەکانی زاهیرو مغدید.
١٩- عومەر مەنصور.
٢٠- وەستا محمد عمر باوکی شامیل و کامیل.
٢١- مام کەریم باوکی شەهید دلشاد.
٢٢- وەستا سەعید

جگە لەم جۆرە پێلاوە لەکۆیە سۆل دروست دەکرا بەسەر پێوە دەکرا پیرە ژن لەپێیان دەکرد لە وەستا باشەکان:

١- وەستا صابر.
٢- فەقێ برایم.
٣- حەمە سۆل دروو.

٤- وەستا مەجیدی سۆل دروو.

٥- وەستا قادری سۆل دروو.

جگە لەمانە وەستا هەبوو قاپ قاپەی داریان دروست دەکرد لەدار سەرپەنجەکان قایش بوو ئەم جۆرە پێلاوە وەک نە علی ئێستابوو ژن لە پێیان دەکرد پیاویش لە حەمام و مزگەوتەکان بەکاریان دەهێنا ژن و کچ کە قاپ قاپەیان لەپێ دەکرد لەکۆلان کە دەرۆیشتن دەبوو بە تەقە تەق سۆل درووەکان قاپ قاپەشیان دروست دەکرد لەکۆیە پێلاوی کەلاش دروست دەکرا بنەکەی ئیسفنج بوو لە وەستاکان:

١- وەستا تحسین.

٢- وەستا سلام.

٣- وەستا ئیسماعیل منصور.

جگە لەمانەی کەباسمان کرد وەستایەکان هەندێ کاری دیکەیان دەکرد قۆ ندەرەیان بزمار رێژ و نارچە دەکرد هەندێکیان سەر پاروی گوێ درێژیان دروست دەکرد هەندێکیان مەشکەو کوندەو تێرکەی



ئاویان چاک دەکرد گەلێک جار قایشیان لە دەوری کەلاش دەدوری بۆ ئەوەی نەدرێ.

جگە لەم پێلاوانە هاولاتیان جزمە و باتەی لاستیکیان لەپێ دەکرد قۆندەرەی وەک ئێستا زۆرکەم بوو.

بەگشت ئەم خاوەن پیشانەیان دەگوت پینە دۆز، جاران پینە دۆز دەزی و درێشەیان بەکاردەهێنا بۆ دروونەوەی پێلاو وپینە لێدان بەڵام ئێستا مەکینە بەکاردەهێندرێت.



## زنجیرەی بیست ویەک

**(پیشەوەرەکانی شاری کۆیەی جاران)**

جگە لەم پیشانەی کە باسمانکردن لەکۆیە هەندێک کەس هەبوون کورەی گەجیان هەبوو گەچیان بەرهەم دەهێنا بۆ دروست کردنی خانوو جاران چیمەنتۆ نەبوو خەلکی خانووی بەبەردو گەچ، بەردو قور، خشتی قور دروست دەکرد ئەوانەی کورەی گەچ دروست کردنیان هەبوو پێیان دەگوتن قەیاغچی کاری بەرهەم هێنانی گەچ زۆرگران بوو بەلام قەیاغچییەکان لەپێناو پەیداکردنی بژێوی ژیان ململانێیان لەگەل سروشت دەکرد کۆیە کانگای گەچی زۆرە لەهەر شوێنێک کانگای گەچی لێبووبێ کورەیان لێ دامەزراندووە چەند کورەیەکی گەچ هەبوون لە دەورو پشتی کۆیە بەتایبەتی لەنزیک هەواوانی خواریَ لەسەر رێگای کۆیە هەولێر نزیک شێخەروان لەنزیک گوندی حەمە بایزان گردی کوران. لە قەیاغچی یە بەناوبانگەکان:

١- خوالێخۆشبوو حوێز صادق اغا.
٢- خوا لێخۆشبوو مام حەمەد وەزیر.
٣- عەزیز مام حەمەد وەزیر.
٤ - مغدید مام حەمەد وەزیر.
٥- خوا لێخۆشبوو مامە جاف حەمە علی.
٦- کاک رفیق حەمە علی.
٧- خوا لێخۆ شبوو عمر سلیم.
٨- خوا لێخۆشبوو تاهیر مام سابیر.
٩- خوالێخۆشبوو تۆفیق اسماعیل زریان.
١٠- حمید اسماعیل زریان.
١١- شێخ کمال مام مەحمودەیی.
١٢- خوا لێخۆشبوو زاهیر مام رشید.
١٣- کاک حوێز برازای مام حەمەد وەزیر.
١٤- خوا لێخۆشبوو جلال صادق اغا.

١٥- خوالێخۆشبوو عەدە بەرەک.
١٦- کورەکانی مام حەمە غەریب.
١٧- کورەکەی مامە جاف، کاک رزگار.
١٨- خوالێخۆشبوو علی مام رەشید.
١٩- خوالێخۆشبوو فتاح سمایل زریان.
٢٠- خوالێخۆشبوو طاهر مام سابر.
٢١- خوالێخۆشبوو زاهیر مام سابیر.

عەدەبەرەک لەکاتی گەرانەوەی لە کوران ئاو بردی بەولاخەوە ئێستا لافاوی عەدەبەرەک بووە بە مێژوو چونکە لافاوەکە لەچواری حوزەیران روویدا لەسالّی ١٩٥٦.

جاران کورەیان بەدار دەسوتاند بەم دوایی یە بەنەوتی رەش کە کورەیان دەسوتاند دووکەل بەرز دەبووەوە لەناو شاری کۆیە دیاربوو قەیاغچی بۆ گەچ وردکردن بارگینیان بەکاردەهێنا بەم کارەیان دەگوت مەدار بەلاّم ئێستا سەیارەی طاحونە هەیە جاران سەیارە نەبوو بۆگواستنەوەی گەچ بۆ ناوشار گوێ درێژ بەکار دەهات بۆ گواستنەوەی گەچ دەپانزدە گوێ درێژ شەلتەی گەچیان لێ بار دەکرا بە









دوویەک دەکەوتن لە کوران بەرەو شار ئەوەی سەیربوو کەرێک لە پێش هەموو کەرەکان دەرۆیشت زەنگورەکی گەورەی بەملیەوەبوو لە دورەوە دەنگی دەهات ئەمە بۆ ئاگادارکردنەوە بوو ئەگەر مندال لە کۆلان بووایە دایکەکان بەخێرایی دەچوونە دەرەوە مندالەکانیان دەهێنا ژوورەوە جگە لەمە کەری پێشەنگ شارەزابوو کە دەگەراوە کەرەکانی دیکە ی دەبردەوە کوران بەڵام لە حەفتاکان بەگەلابە و تراکتەر گەچ دەگوازنەوە بۆ ناو شارو شوێنەکانی دیکە جاران نرخی گەچ بەباربوو بەڵام ئێستا بەمەترە بەڵام بە داخەوە ئێستا ئەم پیشەیە بەرەو نەمان دەچێ بلۆک و چیمەنتۆ شوێنی گەچی گرتۆتەوە بۆ دروستکردنی خانوو.

## زنجیرەی بیست ودوو

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

لەمەوبەر باسی قەیاغچی یەکانمان کرد بەڵام با ناوی ئەم وەستایانە بزانین کە خانوویان بەگەچ دروست دەکرد:

١- وەستا حمدامین وەستا شاکر.

٢- خوالێخۆشبوو وەستاعەبدە وەستا شاکر ناسراو بەعەبدە خەوە.

٣- خوالێخۆشبوو وەستا فتحی کاکە شێخ صالح.

٤- خوالێخۆشبوو وەستا حەوێز یاشەوکەت.

٥- خوالێخۆشبوو وەستا اسماعیل.

٦- خوالێخۆشبوو وەستا عبدالرزاق مام حمدامین.

٧- خوالێخۆشبوو وەستا علی مامە رزاق.

٨- وەستا عبدالله ئێستا لە هەولێرە.

٩- خوالێخۆشبوو وەستا بکر، باوکی شەهید محەمەد بەکر.

١٠- خوالێخۆشبوو وەستا عبدالله وەستا بکر.

١١- خوالێخۆشبوو وەستا رشید.

١٢- خوالێخۆشبوو وەستا خورشید.

١٣- خوالێخۆشبوو وەستا رشید مام حمیدکاری لە کورانیش دەکرد.

١٤- وەستا حەمەرەش.

١٥- خوالێیخۆشبوو وەستا واحید دیگۆل.

١٦ - خوالێیخۆشبوو وەستا رەشید حاجی عبود.

١٧- وەستا ئازاد رشید حاجی عبود.

١٨- وەستا تۆفیق مەلا کەریم.

١٩- وەستا سالح مەنسور وەستای دروستکردنی کاڵەکیش بوو.

٢٠- وەستا حەوێز گۆمەشینی.

وەستای گەچ هەشت کرێکاری لەگەل خۆی دەبردە شوێنی کارکردن یەکێک لەوانە خەلفەبوو واتە یاریدەدەری نزیکی وەستا ئەوانی دیکە هەبوو بەردی دەکێشا هەبوو بەردی بۆ وەستا هەلدەدا

هەبوو گەچی دەهاویشت بۆ وەستا هەبوو تەشتەگەچی دەکێشا هەبوو تەشتی خاوێن دەکردەوە ئەوجا دەیان کرد بە دەنگە دەنگ و هەرا وەستای جاران دەیانزانی گونبەت و چاتی دروست بکەن هەندێک وەستا لەگوندەکان خانوویان بە بەردو قوریا بەخشتی قور دروست دە کرد وەستای جاران بۆ ئە وە ی دلنیا بیٚ لە راستی دیوار شاولیان بەکاردەهێنا لەگەل تەناف لەسەرەتای شەستەکان رۆژانەی وەستا دینارێک بوو هی کرێکار سیٚ پەنجایی بوو لەحەفتاکان رۆژانەی وەستابوو بە ١٥/دینار هی کرێکاریش بوو بەهەشت درهە م لە کۆیە دوو وەستا هەبوون کاری قورو سواغیا ن دەکرد:

١- خوالێخۆشبوو مجید مام کریم دەباغ.
٢- خوالێیخۆشبوو سمایل یازەوە قورکێشێکی زۆر بەهێزبوو.
٣- خوالێخۆشبوو فریاد حەمە سدیق.
٤- خوالێخۆشبوو مستەفا احمد شینە.
٥- خوالێخۆشبوو قالە لار.
٦- خوالێخۆشبوو حسێن شەولەبان.

مام مەجید قەلەو زۆر بەهێزوو بالا بەرزبوو کاری وای دەکرد ئەمرۆ شۆفەرو کرێن ئەنجامی دەدات مام مجید شۆفەری زەمانەبوو ئەم پیاوە قورە سۆری دەگرتەوە لەکۆلانە تەنگەبەرەکانی کۆیە بۆ سواغی سەربانی خانووەکانی کۆیە ئەم قورەیەک هەفتە دەماوە بۆ ئەوەی باش بخوسێتەوە قور دەبوو کاو خۆیٚ ی تیٚ بکرێت رۆژانە دەبوو وەستا ئەم قورە هەرگێرو وەرگێر بکات قور بۆیە کای تێدەکرا بۆ ئەوەی سواغەکە نە قەرشیٚ بۆیەش خویٚ ی تێکەل دەکرا بۆ ئەوەی گیا لەسەربان نەروێت.

بەراستی ئەم کارە زیرەکی کۆیی یەکان دەردەخات زۆرجار بەدرێژایی قورەگیراوەکە بەردیان دادەنا بۆ ئەوەی خەلک بەسەری دا برۆن گەلێک جار لاقمان دەخزی و دەکەوتینە ناو قورەکە دوای هەفتە کە مام مەجید دوو کرێکاری لەگەل خۆی دەهێنا خۆی و کرێکارێک

سندوقی قور کێشانیان لەپشت دەبەست بەشریت یا بەگوریس ئەوجا کرێکارێک بە خاکەناس قوری بۆ لەناو سندوقەکە دەکردن کەپری دەکرد مام مجید بەقادرمەی دار سندوقە قوری دەبردە بالەخانەی دوو نهۆم کە کۆشکیان پێ دەگوت مام مجید کە سندوقە قوری دەگەیاندە سەربان سەری خۆی شۆر دەکردەوە قورەکەی وەک شۆفەر هەڵ دەرشت بەخێرایی دەگەراوە بۆ قورهێنان باوەرتان هەبێ کێشی سندوقە قور زیاتر بوو لە ٨٠/کیلۆ غرام بەیەک رۆژ دوو سێ گەلابە قوریان بەسەر دەخست بە قادرمەی دار و لەسەربان بلاویان دەکردەوەو لوسیان دەکرد و ئاوەرۆیان دەدایێ کرێکاری جاران بەم شێوەیە بوو بەڵام کرێکاری قور شتێکی زیاتری وەردەگرت رۆژانە هەموو خانووەک لە کۆیە بانەکەی قور بوودەبوو بە دوو سێ سال جارێک سواغ بکرابایە بۆ ئەوەی دلۆپە نەکات لە لایەکی دیکە چونکە سەقفی خانووەکان دارو حەسیربوو چۆلەکەو پەرە سێلکە هێلانەیان لەبن میچ و سواندە دەکرد سەربانەکانی خراپ دەکرد بۆیە دەبوو سەربانەکان سواغ بکرابوایەوە ئەم گلەی کە بۆ سواغ بەکاردێ پێ ی دەگوترێ گلە سۆر لە دەورو پشتی کۆیە ئەم جۆرە گلە زۆرە بەداخەوە خانووە کۆنەکانی کۆیە بەرەو رووخان و لەناوچوون دەچن لەم سەردەمە هاولاتیان خانوو لەبلۆک و سەقفی سەبی چمەنتۆ دروست دەکەن بۆیە سواغی سەربان نەماوە هەر بۆیە خانووی جاران لە زستان گەرم و لە هاویندا فێنک بوو.





## زنجیرەی بیست و سێیەم

### (پیشەوەرەکۆنەکانی کۆیەی جاران)

لەشاری کۆیە هەندێک وەستای شارەزای لێبوو کە کاری دارتاشیان دەکرد هەموو پێداویستیەکانیان دروست دەکرد لەکەل و پەلی ناومال و کشتوکالی و جوانکاری وەک لانک ئیغدان دۆلاب مێز ئاوێنەی بەچوار چیوە لەپێش بوک گواستنەوە بەکاردەهات دەرگای خانووی بە نەخش بێژینگ سەرەد لەناوەراستی شەستەکان دارتاشەکان جۆرە سندوقەکیان دروست دەکرد لە دار ناوەکەی پلێت بوو بەفری خوایی و سە هۆلیان دەخستە ناو لەجیاتی سەلاجەی ئەمرۆ چونکە هیچ کەسێک لەکۆیە سەلاجەی نەبوو خەلکی بۆ هەلگرتنی خواردن و ئاوی سارد سودیان لە کوپەو شەربەو بن کوپ وەردەگرت.

ثەلاجە لە دوای ناوەراستی شەستەکان هاتە کۆیە کە بەنەوت کاری دەکرد لە ئێران دەیان هێنا قەبارەکەی ٩ /قەدەم بوو یەکەم کەس کە سەلاجەی کری ست خەجاوی حاجی صابر بوو دوایی وردە وردە ثەلاجەی کارەبایی جۆری کۆلد پۆینت/لوبنانی بوو پەیدابوو دارتاش کورسی و تەپلەی چایخانەو قوتابخانە و فەرمانگەکانیان دروست دەکرد دارتاشەکان جۆرە شتێکیان دروست دەکرد کە چوار چیوەکە ی داربوو ناوەراستەکەشی جۆرە روەکێک بوو پێیان دەگوت شەواشینک پەتکەکی درێژیان تێدەخست بۆ جولە پێکردنی ئامێرەکە ئەم ئامێرە لە فەرمانگە گەورەکان بەکاردەهێنرا بۆ ساردکردنەوەی ژووری بەرپرسەکان لەهاویندا لەجیاتی مبردەی بەکاردەهات زوو زوو کابرایەک شریتەکەی رادەکێشاو دەیهێناو دەیبرد ناو ناویش ئاوی بەم شەواشینکە دادەکرد بۆ ئەوەی هەوایەکە فێنک بێ کابرای کرێکار دەبوو هەتا دەوام تەواو دەبێ کار بەم هەوا سارد کەرەوە بکات.

جاران کاری دارتاش زۆر زەحمە ت بوو چونکە هەموو کارەکان بەدەست ئەنجام دەدرا مشاری گەورە هەبوو بە دووکەس ئیشیان پێ دەکرد داری گەورەیان پێ شەق دەکرد بۆ دروست کردنی کەل و پەل جگە لەمانە دارتاشەکانی کۆیە جۆلانەی دارو چەرخ و فەلەک و

سندوقی داگرتنی فەردە توتن و داری گاسن و دەسکی داس و کلیلی دار بۆ دەرگای دار کە بە پشک کلیل دەدرا لە جیاتی کێلون و سویچی ئێستا لە وەستا دارتاشە کۆنەکانی جارانی کۆیە.

١- خوالێخۆشبوو وەستا عمر مەلا واحد لە وەستا بەناوبانگەکان بوو هەموو جۆرە کەل و پەلێکی ناومالانی دروست دەکرد لە دار گوێز دوو ئیغدانی دەستکردی وەستا عمر کە لە سالی ١٩٤٥/ دروستی کردووە لای بەندەیە جگە لە کاری دارتاشی تاقمی کێلە قەبری دروست دەکرد بە خەتێکی جوانیش لەسەر کێلە قەبر نووسینی هەلدەکەند جگە لەم کارە کاری نە خشەدانانی بالەخانەو تەختە بەستنی سەقفی ی بالەخانەو پردەکانیشی دەکرد.

٢-خوالێخۆشبوو وەستا زاهیر.

٣-خوالێخۆشبوو وەستا سید علی.

٤-خوالێخۆشبوو وەستا حمید.

٥-خوالێخۆشبوو وەستا عمر باوکی کریم و شەهید فەرەیون.

٦-خوالێخۆشبوو وەستا سمایل و کورەکانی، کە جەنجەری درووست دەکرد.

٧-خوالێخۆشبوو وەستا علی نەجار.

٨-خوا لێخۆشبوو وەستا سلێمان و بەکرو قادر و خالد.

٩-خوالێخۆشبوو وەستا کمال حمد بەگ.

١٠-خوالێخۆشبوو وەستا عمر عەودالانی.

١١-خوا لێخۆشبوو وەستا سورە باوکی وەستا حمید.

١٢-خوا لێخۆشبوو وەستا جمال خدر.

١٣-خوالێخۆشبوو شەهید هەلۆ باقی.

١٤-خوالێخۆشبوو وەستا عبدالله و کاک وهابی کوری.

١٥-خوالێخۆشبوو وەستا حمد.

١٦-خوالێخۆشبوو وەستا سعید پیروت.

١٧-وەستامحمود حوێز.

١٨-وەستا سوپا باقی.

١٩-وەستا هەلکەوت.

٢٠-خوالێخۆشبوو وەستا حسێن نجار.
٢١-خوالێخۆشبوو وەستا مستەفا.
٢٢-وەستا دلاوەر.
٢٣-خوالێخۆشبوو وەستا احمد على گچکەل.
٢٤-خوالێخۆشبوو وەستا محمد عل گچکەل و کورەکەی کاک مۆفق.
٢٥-وەستا کاوە.
٢٦-وەستا سیامند.
٢٧-وەستای دەست رەنگین مامۆستا عبدالرحمن حاجی مستەفاچەلەبی جوانترین مۆبیلات و تاقمی دروست دەکرد.
٢٨- وەستا فوئاد رشید مام یحیا.
٢٩- وەستا دلشاد سەید حەسەن.
٣٠- شەهید وەستا حمید اسماعیل حاجی رسول کە لەمانگی ٧ تەمووزی ١٩٦٣ لە کۆیە گولەباران کرا.
٣١- وەستا ئازاد عبدالله.
٣٢- وەستا طاهر کریم فەقێ محمد ناسراو بە طاهر منیف یەک بوو لەدارتاشە بەناوبانگەکانی کۆیە کە جگەلەپیشەکەی خۆی دامەزرێنەری سەرجەم پردەکانی نێوان کۆیەو هەولێر، کۆیەو دوکان بووە بۆیەش پێیان گۆتیە منیف لەبەر زیرەکی بووە.

بەراستی دارتاشەکان رۆلەکی باشیان هەبوو بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی کۆیەو دەوروبەر بەڵام بەداخەوە بەشێکی زۆریان کۆچی دواییان کردووە هەندێک لەم کەل و پەلانەی کەکاتی خۆی دروستیان دەکرد نەماون.





## زنجیرەی بیست و چوارەم

### (پیشەوەرەکۆنەکانی کۆیەی جاران)

کۆیە یەکێک بووە لەشارەکانی کوردستان کە توانیویەتی پشت بەخۆی ببەستێت بۆدابین کردنی پێداویستییەکانی رۆژانە بۆ ناوەوەو دەوروبەری بەهۆی هەبوونی وەستاو پیشەوەری شارەزا لەم شارە پیشەوەری توتنچی لێبوو کەخەریکی جگەرە دروست کردن بوون بەتوتنی خۆمالی جگەرە فرۆشەکان لەماڵەوە جگەرەیان لە قەمیشە جگەرە دروست دەکرد قەمیشە جگەرە بەسندوقی گەورە لە موصل دەهات لە شێوەی جگەرە بوو فلتەری پێوە نەبوو لەماڵەوە ژمارەیەکی زۆریان لەناو قالبەکی گەورەی قایش دادەنا توتنی وردو چاک کرایان تێدەکرد ئەم قالبە قایشە لەسەر سینی یەک دادەنرا کابرای توتنچی چەند جارێک قالبە جگەرەکەی بلند دەکردو لە سینیەکەی دەدا بۆ ئەوەی توتنی ناو قەمیشە جگەرەکە باش بچێتە باریەک وتوندبێ دوایی توتنچی وردە وردە توتنی بەسەر قالبی قەمیشە جگەرەکە دادەکرد تاقەمیشەکە هەمووی پردەبێ لە توتن بەیانی جگەرە فرۆش بەقالبەوە جگەرەی دەهێنا دوکان بۆ فرۆشتن جگەرە فرۆش هەر ١٠ جگەرەی لەناو کاغەزێک دەپێچا بەم شێوەیە جگەرەی بۆ فرۆشتن ئامادە دەکرد نرخی١٠/جگەرە ١٠/فلس بوو ئەمانەی کەپیشەی جگەرەو توتنیان دەکرد لەکۆیە.

١- خوالێخۆشبوو کمال مام وهاب.
٢- خوالێخۆشبوو ستاری مام حەمەدەمین داروغا ناسراوبوو بەستاری چایەچی.
٣- خوالێخۆشبوو عثمان جگەرە فرۆش.
٤- خوالێخۆشبوو حمدامین جگەرە فرۆش.
٥- خوالێخۆشبوو حاجی رەزا مام ئۆمەر.
٦- خوالێخۆشبوو قادر جگەرە فرۆشی.
٧- خولێخۆشبوو حاجی عمر حاجی احمد.

٨- کەریمی جگەرە فرۆش باوکی م.دلشاد.

٩-کاک ئیسماعیل مام ئۆمەری جگەرە فرۆش.

ئەمانە توتنی بۆنداری ناوچەی شاوریێان هەبوو بەکیلۆ دەیان فرۆشت ئەوکات نرخی کیلۆ توتنێکی باش یەک دینناربوو ئەم پیشەوەرانە دەفتەرە سیخارەو قدوی جگەرە پێچانەوەو هەموو جۆرە پاکەتە جگەرەیەکیان دەفرۆش وەک پاکەتی غازی پاکەتەکەی مقەبای زەردبوو، پاکەتی تورکی پاکەتەکەی مقەبای سپی بوو وێنەی شاخی سارای دوکانی لەسەربوو، پاکەتی جمهوری ئەویش پاکەتەکەی مقەبای سپی بوو دروشمی شیعاری جمهوری لەسەربوو جگەرەی ئەم پاکەتانە بێ فلتەربوو جگە لەمانە جگەرە فرۆش چەرخی بەردە ستێ و چەرخی سادە کە بەبەردە چەرخ کاری دەکرد لەگەل قەنەو سبیل و دار جگەرەیان دەفرۆشت ئەم کەرستانەی جگەرەکێشان لەلایەن دۆم و هەجیجیە گەریدەکان دروست دەکراو دەفرۆشرا ئەم هەجیجیانە بەهاران لە سنووری هەورامانەوە دەهاتن خول خولەو تەشی و سەرەدو بێژینگ و قەفەسی کەوو کەلاشیان دروست دەکردو دەیان فرۆشت ئەمانە کە دەهاتنە کۆیە لە کانی بسکان تاوریان هەلدەدا چەند رۆژێک دەمانەوەو گوند بە گوند دەگەران بژێوی ژیانی خۆیان پەیدا دەکرد ئەمن و ئاسایش بەر قەراربوو بەڵام دوای هەلگیرسانی شۆرشی ئەیلول ئەم گەریدانە وازیان لەگەران هێنا دەترسان.

جگە لەم پاکەتە جگارانە ی کە باسمانکردن دووجۆری دیکەش پاکەت هەبوون گریڤن و رۆسمەن بەڵام نرخیان گران بوو جگەلەمانە هەندێک بازرگانی گەورە هەبوون کە پیشەیان توتن کرین بوو ئەم بازرگانانە پارەیان دەدا بەجو تیارانی دەشتی بیتوێن بە دوو شێوە یا بەسەلەم یا بە چوار یەک و پێنجیەک سەلەم بەم شێوە بوو.

سەلەم جوتیار پارەی لە پێشەوە لە بازرگان وەردەگرت لەسەر نرخێک رێک دەکەوتن دەبوو کەتوتن دێتە بەرهەم هەموو توتنەکەی تەسلیم بەم بازرگانە بکردبایە لەسەر ئەم نرخەی کە لەسەری رێک

کەوتبوون نرخەکە زۆر کەمتربوو لەنرخی بازار بازرگان پارەی خۆی وەردەگرتەوە بەتوتن ئەگەر توتنەکە زیاتر بوایە پارەی ئەم زیادەیە دەدرا بەتوتنەوان بەڵام چواریەک و پێنج یەک بەم شێوەیەبوو توتنەوان پارەی لەبازرگان وەردەگرت بەمەرجێک کە بەرهەمەکەی پێ گەیشت توتنەوان دەبێ لە هەرچوار فەردە یا لەهەر پێنج فەردە دەبێ فەردەیەک بدات بەبازرگان دوایی دەبێت پارەکەش بگەرێنێتەوە بۆ بازرگان جاران بەم شێوەیە بازرگانەکان توتنیان دەکری.

هەر بۆیە لەسالی ١٩٦٧ کارگەی توتن لەکۆیە دروست کرا لەلایەن بەلێندەرانی خوالێخۆشبوو کاک عثمان عەونی و کاک محمد مەلا صابر کۆیە لەبەر ئەوەی بەرهەمی توتنی زۆربوو فەرمانگەیەک هەبوو تایبەت بەتوتن ناوی دائرەی انحصاربوو ئەم فەرمانگەیە شوێنەوارێکی گرنگ بوو بەڵام بەداخەوە لەلایەن حکومەت تێکدراو کرا بەکتێبخانەی کۆیە لەم شوێنە توتن فەحس دەکرا حکومەت توتنی لەبازرگان و توتنەوان دەکری بەپێی باشی و خراپی نمرەیان دادەنا لەسەر فەردە توتن بەم شێوەیە فەلاح بەیانی زوو فەردە توتنەکانی دەبرد بۆ ناو ساحەی انحصار لیژنەی فەحس فەردە بەفەردە دەگەرا تەماشای دەکردن نمرەی بەپێ ی باشی و خراپی لەسەر گونیەکە بەمۆری تایبەت دادەنا نمرەیەک دوو سێ چوار پێنج هەبوو توتن رەوانەی بەغدا و سلێمانی دەکرا چونکە کارگەی جگەرەی لێبوو هەموو توتنەوانێک دەفتەرێکی تایبەتی لەلایەن حکومەت بۆ دەکرا فەرمی بوو بەپێ ی ئەم دەفتە رە حکومەت توتنی لە توتنەوان وەردەگرت بازرگانەکانیش کەپارەیان دەدا بە توتنەوان ئەم دەفتەرەیان وەک زەمان لە توتنەوان وەردەگرت و لەلای خۆیان دەیان گێراوە هەندێک توتنیش دەنێردرا کارگەی پاکردنەوەی توتن لەکۆیە لەبەرێوەبەرەکانی توتن فەحس کردن لەکۆیە.

١- خوالێخۆشبوو کریم توفیق.

٢- بکر مام رەزا قەلادزەیی.

٣- کاک خیرالدین محی الدین.

گەلێک جار لە سلێمانی و هەولێر لیژنە دەهات لـە فەرمانبەرەکانی ئەم فەرمانگەیە.

١-خوالێخۆشبوو محمد حاجی گەورە.

٢-خوالێخۆش بوو عمر کریم حەمشین.

٣-مام معروف باوکی مامۆستا فریاد.

٤-کاک جەوهەر حوێز قادر.

٥-ئەحمەد مەحموود ناسراو بە ئەحمەدی یاروقیا.

٦-گۆگەی دیان.

٧-میخەی دیان.

٨-خوالێخۆشبوو مغدید قادر.

٩-خوالێخۆشبوو کاک معروف برای جلال زێرنگر.

١٠-کۆسرەت کریم ئاغا.

١١-خوالێخۆشبوو عبدالرحمن ملاقادر گۆپتەپە.

١٢-سیامند عادل اغا.

١٣-محمود عادل اغا.

١٤-شەکرە عمر اغا شەو گێر.

١٥-یعقوبی دیان ملاحظ بوو.

١٦-کاک دلاوەر احمد حوێزی.

١٧-خوالێ خۆشبوو حمید اغا کاکە زیاد بەرێوەبەربوو.

١٨-کاک صلاح حەمە سەعید زۆر جاران لیژنەی فحص بوو.

١٩-دکتۆر صالح حەمە سەعید بەرێوبەری کارگەی توتن بوو.

٢٠-کاک فاتح مجید.

٢١-خوالێخۆشبوو عبدلله اغا.

٢٢-خوالێخۆشبوو کاک سلیمان، باوکی خوالێخۆشبوو دڵشاد.

٢٣-خوالێخۆشبوو کاک حمد باوکی کاک ئاسۆی بانک.

٢٤-ئەحمەد کاکە.

٢٥-خوالێخۆشبوو حەمەی انحصار.

٢٦-خوالێخۆشبوو حەمە مەغدید حەمەد ئەمین.
٢٧-خوالێخۆشبوو عبدالله حاجی ئەمین ژمێریار بوو.
٢٨-خوالێخۆشبوو شێخ نەسرەدین تاڵەبانی.
٢٩-خوالێخۆشبوو زاهیر مام برایم.
٣٠-خۆالێخۆشبوو مام کاکل باوکی حەسەن و حسێن.
٣١-کاک عەزیز مام ئەبرەهای دیان.
٣٢-عبدالکریم توفیق بەرێوەبەری گشتی بوو.
٣٣-خوالێخۆشبوو عبدالرحمن طه.
٣٤-خوالێخۆشبوو حاجی معروف.
٣٥-کاک فەرهاد عەونی.
٣٦-کاک خەسرەو عەونی.

داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر ناوم لە بیرچووبێ جاران توتن قەدەغەبوو قۆرچی ئەو کەسانەیان دەگرت توتنیان بفرۆشتبایە بێ مۆلەت کەسانێک هەبوون لەکۆیە بازرگانیان بەتوتن دەکرد توتنیان لە کۆیەوە بەقاچاغ بەزێ ی تەق تەق بەکەلەک دەبردە تکریت لەوانە خوالێخۆشبوو مەلا زاهیر.

ئەوانەی کەپیشەی بازرگانی کردنیان بەتوتن دەکرد:

١- کاک عثمان عەونی.
٢- وەستا حسین نەجار.
٣- حاجی جلال.
٤- عزیر مام عبدالله.
٥- محمد عمر دباغ.
٦- عزیز چەلەبی.
٧- کاک اسماعیل ملانوری.
٨- احمد بەگ.
٩- کاک رشید.
١٠- حمدطه، باوکی شەهید زاهیر.

١١- ئەحمەد مام یەحیا.
١٢- کاک باقی حاجی جلال.
١٣- حاجی ئامینە.

بەداخەوە هیچیان لەژیان نەماون ئەم پیشەیە بەرەو نەمان چوو ئێستا توتن زۆر بە دەگمەن دەچێندرێت کارگەکانی جگەرە هیچیان نەماون جاران دەفتەرە سیخارەو بەر ماغ هەبوو بۆ جگەرە دروست کردن بەکاردەهات هەموو کەرستەیەکی توتن لەکۆیە هەبوو وەک داوی توتن پێوەکردن سندوقی توتن داگرتن شیشەی توتن قەیناغ گونیەی خەت سۆر بۆ فەردە توتن داگرتن بەکاردەهات.






## زنجیرەی بیست و پێنجەم

### (پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیەی جاران)

جاران لە کۆیە هەندێک پیشەوەر هەبوون شیرنەمەنییان دروست دەکرد لەسەر سینی دایان دەناو لەسەر سەریان دەناو بەکوچەو کۆلانە تەنگەبەرەکانی کۆیە دەسورانەوە هاواریان دەکرد شەکەرات شەکەرات مندالان کاتێ گوێیان لە دەنگی شەکەرات فرۆش دەبوو لەمالەکانیان دەهاتنە دەرەوەو لەدەوری کۆدەبوونەوە هەبوو بای دووفلس شەکەراتی دەکری هەش بوو بای عانەیەک کە عانە چوار فلس بوو مووچانەمان عانەیەک بوو.

چەند کەسێک لەکۆیە شەکەراتی جۆراو جۆریان دروست دەکرد وەک مەعجونی سپی و رەنگاو رەنگ لەبزینە کونجی و شەکر شروبی سۆر لەسەر ئارد لوقم بەهەموو جۆرێک بەسادەیی و بەگوێز پاقلاوە لوقمە قازی شلکێنە جۆرە شیرنەمەنی یەک بوو لەمالان دروست دەکرا هەویری شلیان بەسەر سێری نان دادەکرد دوایی پارچە پارچەیان دەکرد شەکراویان پێدادەکرد هەموو کابانەک نەیدەزانی وەستای خۆی هەبوو جگە لەم شیرنەمەنیانە محەلەبی بەئاردە برنج دروست دەکرا چونکە کاستەر نەبوو جگە لەمانە زۆر جار دایکم پێ ی دەگوتین ئەگەر بەقسەم بکەن ئەمشەو حەلواتان بۆدەکەم حەلوای بەئاردو رون و شەکر بۆ دەکردین گوێزی لەسەر دادەنا جاری واهەبوو شەوانە لوقمیان لەنشاستە بۆ دروست دەکردین لەسەر سینی روویان دەکرد بەچەقۆ دەیان بری پارچە پارچەیان دەکرد شیرنەمەنیەکی دیکە هەبوو پێیان دەگوت سەمەنی لەکۆیە دوومال دروستیان دەکرد.

١- خوالێخۆشبوو یاجمیلەی بەکری دایکی مامۆستا مستەفا بەکر.

٢- مالی خوالێخۆشبوو مام عەلی سەمەنی.

خواردنی سەمەنی لە مانگی شوبات دروست دەکرا بەم جۆرە منداڵی گەرەک هەریەک قاپێکمان گەنم دەبرد بۆ پلکە جمیلە خۆشەویستی مندالان بوو کە گەنمەکەمان دەدایە لەتەشتێکی ئاسن

جاویی گەورەی دەکرد جوان دەیشوشتەوە دویی لەسەر گونیەیەک هەری دەخست تاشین دەبۆوە ئەوجا لەمەنجەڵێکی گەورەی دەکردو دەیکولاند ماوەی پێنج سەعات لەسەر ئاگری داری قەراش کەری دادەنا بەردەوامیش بەئەسکوەکی داری گەورە تێکی دەدا منداڵی گەرەک لەخۆشیان لەدەوری مەنجەل هەلدەپەرین و پێدەکەنین و چەپلەیان لێدەدا هەر زوو زوو منداڵەکان دەیان گوت کەنگین پێدەگات هەر منداڵە قاپێکی سفری ئاسنجاوی پێ بوو بۆ سەمەنی.

کەپێ دەگەیشت مەنجەلیان لەسەر ئاگر دەهێنا خوار دوایی بەریز منداڵە بەشداربووەکان رادەوەستان لەکاولی علی بەگ لەبەردەم مزگەوتی مەلا ئەسعەد لای مالی حاجی مجید یاجمیلە بە ئەسکوە دارەکەی سەمەنی بۆ تێدەکردین سەمەنی وەک کاستەر شل بوو رەنگی قاوەیی بوو شیرین نەبوو بەڵام منداڵ دەیان خوارد چ بکەین وەک کاستەری زەمانەبوو ئەمانەی کە شەکەراتیان دروست دەکرد:

١- وەستا ئۆمەر.

٢- وەستا بەکر.

٣- وەستا محمد.

٤- وەستا سابیر.

٥- یا فاتم کاک خدر لە مال معجون و لەبزینە و کونجی و شروبی سەر ئاردی دروست دەکرد.

٦- وەستا مستەفا پاقلاوەی دروست دەکرد.

٧- وەستا مستەفای دۆندرمە یەکەم کەس بوو دوندرمەی دروست دەکرد لەناو عارەبانەکەی دەستگایەکی دۆندرمەی هەبوو دەورەی درابوو بە بەفری خوایی بەردەوام دەستگاکەی دەسوراند، دەستگاکەی دەستکەکی داری پێوە بوو بۆ بادان بەمراکێک دۆندرمەی تێدەکرد پێیان دەگوت گاز ستیل بوو سەرێکی قولی پێوەبوو چوار گازی دۆندرمە لەقاپەکی گچکەی شوشە دەکرد کەوچکەکی گچکەی چای دەخستە ناو قاپەکە بۆ خواردنی دۆندرمە زۆر بەتام بوو نرخی

قاپە دۆندرمەک عانەک بوو جگە لەمانە لەکۆیە شەربەتی مێوژی دروست دەکرا کە بۆ نەخۆش زۆر بەکار دەهات لە وەستا شەربەت فرۆشەکان:

١- وەستا عبدالله مام عبدالرحمن.

٢- خوالێخۆشبوو کاک کەریم حمدشەل.

٣- خوا لێخۆشبوو کاک سلیمان حەمە سعید.

٤- خوالێخۆشبوو میرزا عبدالله مام یحیا.

٥- خوالێخۆشبوو مام بەکر عەودالانی.

٦- خوالێخۆشبوو وەستا عبدالله ترشی فرۆش.

٧- خوالێخۆشبوو رشید مام قادر.

٨- خوالێخۆشبوو حاجی حمدامن کێک هەموو جۆرە کێکو شەکرلەمەیەکی دروست دەکرد.

جگە لەمانەی کە باسمانکردن خوالێخۆشبوو کاک صابر حەلوا هەموو جۆرە حەلوایەکی لەموصل دەهێنا دەیفرۆشت حەلوای زەرد، حەلوا پوشکەسپی بوو بۆیان لەسەر کاغەز دادەنایَن مندالان لەکاتی کرینی معجون جۆرە یاریەکیان بەمعجون دەکرد پێیان دەگوت معجون شکانێ ئەم یارییە لەنێوان دوو مندال رووی دەدا عانەیەکیان لە معجونەکە دەچەقاند بەپت لێیان دەدا ئەگەر معجونەکە دوولەت بووایە ئەوە ئەو مندالە براوە دەبوو معجونەکەی بۆ خۆی دەبرد ئەگەر نەشکابایە ئەوە لایەنەکەی دیکە براوە دەبوو بۆ خۆی دەبرد کۆیە هەموو پێداویستییەکانی دروست دەکرد بەڵام بەداخەوە ئەم شیرنەمەنیانە بەرەو نەمان چوون جگە لەمانەی کەباسمانکرد نانی قەیسی وە هەنجیری وشک کراوەشیان دروست دەکرد لەگەل مرەبای هەنجیر، قەیسی، هەلوژە، بەهێ، هەرمێ، سێو یان دروست دەکرد پێداویستی خۆیان پێدابین دەکرد بەپێچەوانەی شیرنەمەنی لەم شارە هەندێک هەبوون پیشەیان دروستکردنی ترشیات و شەراب و ئارەق و شێلم بەترش بە گێزەری رەش و تەرە ساز و ترخێنە یان دروست دەکرد:

١- وەستا عبدالله ترشی فرۆش ئەم پیاوە دۆندرمەو شێلم بەترش و تەرەسازو ترخێنەی دروست دەكرد.

٢- وەستا عبداللـە مـام عبـدالرحمن شـەربەتی مێـوژ و ترشـی دروست دەكرد.

٣- یا هەیبەت دایكی محمد.

٤- مالی مام كاكە.

چەنـد مـالێكی دیـكەش هەبـوون ئەم پیشـەیەیان دەكـرد ئێـواران منـدالان سـتلۆكەكی ئاسـنجاویان بـە دەسـتەوە دەگـرت دەچـوون بـایی دەفلس شێلم بەترشیان دەكری خەلكی بەزۆری بژێوی ژیانیـان خـراپ بوو بەنان دەیان خوارد وەک ئێستا نەبوو بنێری كەباب و لەفەبێت لەم سـەردەمە ئەم پیشـەیە زۆركەم بووە لەبازار ترشـی دەكرێت دیانەكان شـەراب و ئارەقیـان دروسـت دەكـرد یـاواری ژنە دیـانەک بـوو بەكـوپە ئارەقی دروست دەكرد لەگەل شـەراب لەترێ ی سـپی لەهەمـوو مالێک شەكریان كولاندووە قەندیان دروسـت كردووە بۆ دشـلەمە خـواردنەوە جـگە لەمـانەی كەباسـمانكردن هەنـدێک خـانەوادە تەرۆزی و خەیـار و بیبەرو زەیتون سور دەكەن لەگەل سركەی هەنـار كە لە كۆیە دروسـت دەكرێت دەیكەن بە ترشی یەكی سروشتی.






## زنجیرەی بیست و شەشەم

### (پیشەوەرەکۆنەکانی کۆیەی جاران)

لە شاری کۆیە جاران هەموو جۆرە نانێک دروست دەکرا بەتایبەتی نانی تیری هەموو خانەوادەیەک لەماڵ نانی تیری لە ئاردی گەنمی خۆماڵی دروست دەکرد خانمی جاران لەهەفتەیەک یا زیاتر رۆژێکی بۆ نان کردن تەرخان دەکرد زیاتر لەتەنەکە ئاردێکی دەکردە نان بێ ئەوەی رووی گرژبێ بەیانی لەگەڵ مەلا بانگدان کەل وپەلی نانکردنی ئامادە دەکرد وەک کەولی نان، خوانە، تیرۆگ، ناو برێشک، دوایی ئاگری دادەگیرساند بەداری قەراش کەری ئەوجا سێڵی دەخستە سەرئاگر دانەکەو خانمی ماڵ دەستی دەکرد بەئەنگوت کردن لەم هەویرەی کە شێلابووی.

جاران مەکینەی هەویر شێلان نەبوو ژن بەدەست و بازووی خۆی تەشتە هەویری دەشێلاو دەیکردە نان لەحەوشە لەبەر سەرمای زستان و گەرمای هاوین سەرەرای هەموو ئەم ماندوویەتی یە چێشت و خواردنی ئامادە دەکرد حەوت هەشت منداڵی پەروەردە دەکرد بەکەم دەرامەتی بەجوانترین شێوە سەرەرای هەموو ئەوانە میوانی بەرێ دەکرد جل و بەرگی دەشوشت لەحەوشە مەنجەلە ئاوی گەرم دەکرد چونکە گیزەرو سخانەو هیتەرو غاز نەبوو تارادەیەک خەلکی بژێوی خراپ بوو خێزانەکان توانای کرینی سەلکە سابوونێکی زەردی کولکردنیان نەبوو بەراستی ژنی جاران پاڵەوان بوون زۆر شەتەک و ماندوو بوون ژن نانی دەکرد کۆرپەکەشی لە باوەش دەگرت و شیری دەدایێ هەندێک ژن رەشکە و شمریان لە هەویر دەکرد ئێمە کەمنداڵ بووین لەکاتی نان کردن لای دایکمان دادەنیشتین داوامان دەکرد ئەستوکی بەشەکرمان بۆ دروست بکات تا کۆتایی نانکردن ئەستوکی بۆ دروست نەدەکردین، چونکە سێڵەکە دەبووە شەکراو، نەدەبوو سێڵ شەکراوی پێدا برژابایە. تائێستا تامی ئەم ئەستوکە بەشەکرە لەبن ددان و زمانمانە هیچ یەکێک نییە لە منداڵە کۆییەکان کە ئەستوکی بەشەکری نەخواردبێ هەندێک جار ناسکەنانی بەروونیا بۆ دەکردین هەموو ماڵێک

گەنمی سالانەی عەمبار دەکرد خاوێنی دەکردەوەو دەیان شوشتەوە هەریان دەخست و شکیان دەکردەوە ئەوجا لەگونیەیان دەکرد هەرجارەی دوو تەنەکەیا زیاتریان دەنارده ئاش چەند کەسێک هەبوون باراشیان دەبردە ئاش

١- خوالێخۆشبوو کاک واحد ئاشەوان و کورەکەی کاک نیهاد.
٢- سەیدەی باراش.
٣- مام خدر باراش.

هەر یەکێک لەمانە باراشی گەرەکێکی دەبردە ئاش یەکەم کەس کە ئاشی ئاگری هێناوەتە کۆیە خوالێخۆشبوو کاک مجید حاجی کاکە ئەمین لەسالانی ناوەراستی پەنجا من لە دایکم بیستووە کە لەتەم تەمان و ئاشی ساغەی هەبوو لە نزیک قەسری کاکە زیادیش چەند ئاشەک هەبووە لە ناوەراستی شەست مالی خوالێخۆشبوو وەستا حسین نەجار ئاشێکی دیکەیان دامەزراند لە خوار شارەوانی کۆنی کۆیە جگە لەمانە دەبوو هەموو مالێک تریانە و نان دێن و کەندووی ئارد و چەرخەچی بۆ ئارد تێکردنی هەبووایە.

چەرخەچی:- قاپێکی قولی بەدەسک بوو، لەسەرەتای حەفتاکان سێری غاز پەیدابوو جگە لەمەش پریمزی نەوتی گەورەی نان کردن خوالێخۆشبوو وەستا زاهیر تاهیر مەلا حەبیب کاری دروست کردنی پریمزو غازی دەکرد لەگەل وەستا رەقیب و وەستا نصرالله جگە لەنانی تیری کولێرە بەروون و کولێرە بەگۆشت و کولێرە بەهێلکەو کولێرە بەکونجی و کولێرە بەتزیلک یان دروست دەکرد، لەناو کۆیە لە بری کولێرە زیاتر ووشەی ئەستووک بەکاردەهێنن.ئەم وەستایانە ئەستوک و کولێرەیان دروست دەکرد

١- خوالێخۆشبوو مەلا تەها.
٢- محمد مەلا تەها.
٣- خوالێخۆشبوو وەستا مستەفا.
٤- خوالێخۆشبوو وەستا محمد تەباخ.
٥- خوالێخۆشبوو وەستا عثمان رسول پاراغ وکورەکانی.
٦- وەستا حسن علی افندی.

٧- وەستا جلال وەستا مستەفا.

٨- خوالێخۆشبوو وەستا حمید وسو.

٩- خوالێخۆشبوو غازی احمدخان.

١٠- خوالێخۆشبوو یا خەجیج خێزانی حەمەگران دایکی کاکەمین کولێرەیەکی زۆر نایابی دەکرد لەگەڵ عاسمەی کچی لەماڵ تەندوریان هەبوو هەر لەماڵ کولێرەیان دەفرۆشت جگە لەمە خوالێخۆشبوو کاکەی یامەنیج شاگردیان بوو لەسەر تریانە لە بازار کولێرەی دەگەراند بۆ فرۆشتن.

١١- خوالێخۆشبوو یاخەجیج کاک مەحمود لەماڵ کولێرەی دەکرد رەمەزانانیش کولێرەی بۆ خەڵک سۆر دەکردەوە رەمەزانان هەموو ماڵێک هەویری دەشێلا هەویر ترشیان تێدەکرد لەجیاتی خەمیرە دوای شێلانی هەویرەکەیان گەرم دادەپۆشت دوای نیوەرۆ هەویرەکەیان دەکردە کولێرەی بەروون و کونجی لەسەر تریانە و سینیان دادەنا دوای تەواوکردنی تریانە کولێرەمان لەسەر سەردادەنا دەمان برد بۆلای فرنی نانەوا لە بازار یا دەمان بردە ماڵی یا خەجیجی کاک مەحمود کولێرەیان بەدووفلس سۆر دەکردەوە دوای چاوەرێیەکی زۆر لای نانەوا چونکە قەرەباڵغ بوو دوای تەواوبوون ئەستوکەکەمان لەناو سەرەویلک دەناو دەمان هێناوە بۆ پارشیو بە ماست دەمان خوارد تام و چێژێکی خۆشی هەبوو.

١٢- کاک جعفر مستەفا ئێستا کولێرە بەفرنی غاز دەکات بەڵام تام و چێژی جارانی نی یە نانەواکان هەرشتەشیان سور دەکردەوە دوو ژنە مەسیحی هەبوون. ١- یا سارێ. ٢- یا بەهیە.

ئەمانە جۆرە نانێکیان دەکرد لەسەر خوانە هەویرەکەیان پان دەکردەوە دوایی بە درێژی نانەکەیان قەد دەکرد بەچەقۆیەکی گەورەی هەرشتە برینەوە خێرا خێرا نانە خاوەکەی دەبری دوایی لەسەر سینییان دادەناو دەمان برد بۆ لای نانەوا دەیخستە ناوفرن تا سۆر دەبۆوە نرخی سۆرکردنەوە درهەمێک بوو هەرشتە وەک شعریەی ئەمرۆیە لەگەڵ ساوار دەیان کرد بەچێشتی پراو ساوار یا ساوار بەهەرشتە.

١٣- خوالێخۆشبوو صباح نانەوا.

١٤- کاک فتاح نانەوا.

١٥- خوالێخۆشبوو محمد صابر.

ئەمانە کولێرەیان دروست دەکرد هەندێک نانەوای دیکە هەبوون نانی مادەیان دروست دەکرد:

١- خوالێخۆشبوو وەستا سەلام.

٢- خوالێخۆشبوو کاکە مەم.

٣- خوالێخۆشبوو کاک مغدید میرخان.

٤- وەستا رشاد خدر عارف.

٥- وەستا سیروان فتحی.

٦- خوالێخۆشبوو وەستا شفیق حمد.

٧- خوالێخۆشبوو حاجی رفیق.

جگە لەمانە لە ناوەراستی شەستەکان یەکەم کەس کە فرنی سەمونی حەجەری داناو سەمونی دروست کرد:

١- وەستا عمر فرنەکەی لەتەنیشت هوتێلی سرود بوو.

٢- خوالێخۆشبوو محمد ملاصابر لەسەرەتای حەفتاکان فرنی سەمونیان دانا.

٣- خوالێخۆشبوو کاک عبدالرحمن فرنی سەمونی اوتوماتیکی دانا لەشاری کۆیە بنەماڵەی خوالێخۆشبوو کاک مستەفا جەمیل بەیانیان زوو بەخۆی و مەنجەڵە زرۆبی چایخانە بە چایخانە زرۆبی گەرم و نەرمی دەفرۆشت کە تائێستا هیچ کابانێک ناتوانێ هاوشێوەی یامەنیجی دایکی کاک مستەفا زرۆبی دروست بکات لەنەرم و شلی و چێژی بەراستی سەیرە لەگەڵ رۆیشتی پیشەوەرەکان خواردنەکانیش بەرەونەمان چوون.





## زنجیرەی بیست و حەوت

**(پیشەوەرەکۆنەکانی کۆیەی جاران)**

کاروانچی پیشەیەکی زۆر گرنگ و پێویست بوو بۆ گواستنەوەی هاولاتیان و کە ل و پەل لەنێوان شارەکان تا دەگاتە سابلاخ و شنۆ و سەردەشت و خانە جاران لەکۆیە چەند خانەوادەیەک هەبوون کاریان کاروان چییەتی بوولەوانە.

١- خوالێخۆشبوو مام حەمەغەریبی کاروانچی.

٢- خوالێخۆشبوو قولەی حەمەخان.

٣- خوالێخۆشبوو سمایل حەمەخان و رەحمان و جە لالی کوری.

٣- خوالێخۆشبوو کاک عبداللەی زاوای سمایل حەمەخان.

٤- خوالێخۆشبوو حوێز عمر قالە.

٥- خوالێخۆشبوو مام قادری کاروانچی.

٦- خوالێخۆشبوو حاجی رەزای خارە ئۆمەر.

٧- خوالێخۆشبوو حاجی برایم خارە ئۆمەر.

٨- خوالێخۆشبوو خدر عارف.

٩- خوالێخۆشبوو عمر قالە.

١٠- خوالێخۆشبوو سعید مام رەزا.

کاروانچی رۆلی نەقلیاتی ئێستایان دەدیت هەر کاروانچی یەک چوار پێنج هێستری هەبوو لەگەڵ گوێدرێژێک بۆ مینەکی خۆی جاران ولاخ بەنرخ بوو هەر کەسێک هێسترێک یا ئەسپێکی هەبووایە وەک ئەوەبوو رەنجرۆڤەرێکی هەبووایە ئەگەر گوێدرێژەکی هەبووایە سەیارەیەکی گچکەی هەبوو کاروانچی جگە لەگواستنەوەی هاولاتی کەل و پەلیشیان دەگواستەوە لەنێوان شارەکانی ئەم دیو ئەودیوی کوردستان بازاری کاروانچییەکان زۆرگەرم بوو چونکە رێگاکان باش نەبوون جگە لەمە شۆرشی ئەیلول هەلگیرسابوو رێگای شارەکان لەلایەن حکومەت گیرابوون و ئاستەنگیان دروست دەکرد لەبەردەم گواستنەوەی کەل و پەل بۆیە دەبوو بەولاخ بگوازرێتەوە ئەم پیشەیە

ڕەواجی هەبوو تا ڕاپەڕین دوایی ورده ورده بەرەو کاڵ بوونەوە چوو لەبەر ڕەواجی ئەم پیشەیە لەکۆیە خانی ولاخ زۆربوو لەگەڵ پیشەی ئەم کەل و پەلانەی کە بۆ ولاخ بەکار دەهات وەک کورتان، زین، لغاو، تورەکەی کا، جوار، خرار، تێرکە، زنجیر و قەراسە.

هەندێک شتی دی کەباسمانکردن ولاخ پێویستی بەشوێنێک بوو بۆ پشوودان لەناو شار بەم شوێنەیان دەگوت خان لەکۆیە ئەم خانانە هەبوون بۆ پشودانی ئەم کاروانانەی کەروویان لەکۆیە دەکرد باوەڕتان هەبێ لەشەستەکان و سەرەتای حەفتاکان لەبەر قەرەباڵغی و جموجۆڵی بازرگانی نەت دەتوانی بەناو بازار و قەیسەریەکان تێ پەڕی چونکە لە وەرتێ و خۆشناوەتی و بیتوێن و ڕانیەو قەلادز دەهاتنە کۆیە بۆ کرینی هەموو جۆرە پێداویستی یەک ئێمە دوکانمان لەناو بازاربوو مەجالمان نەبوو وەلامی کریار بدەینەوە بەردەوامیش بەلۆری کەل و پەل لەبەغدا دەهات وەک شەکر هەموو جۆرە چایەک وەک چای پاشا، چای غزال، چای سیفین.هەروەها قوماشی پۆلۆنی و فتاح پاشاو ئەفسەری و کەل و پەلی دیکە.

خانەکان ئەمانەن:

١- خانی گەورە ناسراوە بە خانی گەورە لەناو بازاری کۆیە.

٢- خانی مەلا زادەکان کە بەخانی خوالێخۆشبوو کاک فتحی بەناوبانگ بوو جیرانی مالی مەلای گەورەبوو.

٣- خانی خوالێخۆشبوو وەستا عوسمان لەگوزەری کورتان درووان بوو.

٤- خانی خوالێخۆشبوو وەستا مستەفا لە بەرانبەر مزگەوتی خادم سەجادە.

٥- خانی خوالێخۆشبوو یازبێد لەبەرامبەر پیاو چاک شێخی شێخ موسربوو نزیک قوتابخانەی اولی.

٦- خانی خوالێخۆشبوو مام قادر یاسین لەمەیدانی خوارێ.

٧- خانی خوالێخۆشبوو مام کریم لەبەرانبەر مزگەوتی گەرمک.

٨- خانی خوالێخۆشبوو مام مەعروف لەنزیک مزگەوتی گەرمک لەگەڕەکی دیانان.

ئەم خانانە وەک هوتێل و گەراجی ئەمڕۆ بوو نرخی ڕاگرتنی ولاخ بە پێ ی دووری و نزیکی خانەکە لە بازار دەگۆڕا خانی گەورەو مەلایان و مام عثمان و وەستا مستەفا تایبەت بوون بەناوچەی خۆشناوەتی خانەکانی دیکە تایبەت بوون بەدەشتی کۆیە، لەکۆیە چەند وەستایەک هەبوو ولاخیان نال دەکرد:

١- خوالێخۆشبوو مام عزیز نالبەند.

٢- خوالێخۆشبوو وەستا بەهجەت.

٣- خوالێخۆشبوو وەستا عثمان.

٤- خوالێخۆشبوو وەستا عمر نالبەند.

٥- خوالێخۆشبوو وەستا مستەفای نالبەند.

٦- خوالێخۆشبوو وەستا فەتحوڵڵا نالبەند.

ئەمانە ڕۆڵی پەنچەرچیان دەبینی بەڵام بەداخەوە ئەم پیشەوەرانە نەماون خانەکانیش وێران بوون نالبەندەکانیش نەماون بەم دواییە دوو وەستا کاری نالبەندیان دەکرد کاک عثمانی یائامینەو، ڕەحمانی سمایلی حەمەخان.لەڕاستیدا کۆیە هەموو جوانیە مێژووییەکانی جارانی لە دەستداوە بەتایبەتی دوای ڕاپەڕین مێژووی ئەم شارە بەشێکی پرشنگدارە لە مێژووی کورد جاران هەر وەک چۆن ولاخ بەکار دەهات بۆ سواری و بارکردن، گا بەهەمان شێوە بۆ بار کردن و سواری بەکاردەهات بەتایبەتی ڕەوەندەکان گایان زۆر بەکاردەهێنا.

جگە لەمانە ولاخی گوێدرێژ و هێسترو گایان بۆ زەوی کێلان بەکاردەهێنا پۆلیس ئەسپی بەکاردەهێنا بۆ سواری بۆ چوونە شوێنی دوور وە زوو گەیشتن بۆ ئەو شوێنانەی کەتاوانی لێ ئەنجام دەدرا بەم پۆلیسانەیان دەگوت خەیالە لەکۆیە چەند پۆلیسێکی خەیالە هەبوون وەک.

١- خوالێخۆشبوو سمایل اغای نازەنین.
٢- خوالێخۆشبوو علی قامچی رەش.
٣- خوالێخۆشبوو مام پیرۆت.
٤- خوالێخۆشبوو کاک عزیز باوکی حەربی و کاک ئاشتی.
٥- خوالێخۆشبوو عەبدە قادر.
٦- خوالێخۆشبوو رشید مام قادر.
٧- خوالێخۆشبوو مغدید حەمەرەحیم.
٨- خوالێخۆشبوو کاک مەجید.

بەخۆیان و قامچی یەرەشەکەی دەستیان حوکمی هەموو وراتی کۆیەیان دەکرد خۆزگەمان بەم کات یاسا سەروەر بوو.





## زنجیرەی بیست و هەشتەم

**(پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیەی جاران)**

جاران لەکۆیە چایخانە زۆربوو چونکە میوانەکی زۆر رووی لەم شارە دەکرد بۆ کرینی پێداویستیەکانی ژیان و رۆژانە، زۆربەی چایخانەکان لە ناو بازاربوون جایخانەکان بەناوی خاوەنەکانیان ناودەبران.

١-چایخانەی عزیز تاهیر حەبۆر تا ئێستا لەژیاندا ماوەو لەکارەکەی بەردەوامە.

٢-چایخانای خوالێخۆشبوو عبداللە خاری سەعە کۆر لەنزیک خانی گەورەبوو.

٣-چایخانەی خوالێخۆشبوو سەعەکۆر لە دوای مردنی خاری لە شوێنی ئەو بەردەوامی بەکارەکەیدا.

٤-چایخانە ی خوالێخۆشبوو قادر حەمەد ناسراو بە قادری فقێ گولێ چایخانەکە دەکەوتە سەرتاقی سەری مەیدان نزیک خانی گەورە

٥-چایخانەی خوالێخۆشبوو مام صابر برای مام حەمەشین لەنزیک گوزەری کورتان دروون دوای ئەو قادری حاجی حەسەنی سناوە کاری لەم شوێنە دەکرد.

٦-چایخانەی خوالێخۆشبوو عبداللە مەلا فتح الله مەلاعباس.

٧-چایخانەی خوالێخۆشبوو مام سمایل.

٨-چایخانەی خوالێخۆشبوو کاک رسول مەزن.

٩-چایخانەی خوالێخۆشبوو کاک مەهدی.

١٠-چایخانەی خوالێخۆشبوو مەمەند تەها لەناو بازار.

١١-چایخانەی خوالێخۆشبوو قادر مام حسین.

١٢-چایخانەی خوالێخۆشبوو کاک رفیق حمد مەیتەر.

١٣-چایخانەی خوالێخۆشبوو کاک مستەفای سۆفی قادر.

١٤- چایخانەی خوالێخۆشبوو کاک صدیق مەلا سالح.

١٥-چایخانەی خوالێخۆشبوو زاهیری مام تاهیر.

١٦-چایخانەی زاهیری مەلا رەئوف.
١٧-چایخانەی فتاح نانەوا.
١٨-چایخانەی خوالێخۆشبوو شەهید سلیمانی حەمە قاوەچی.
١٩-چایخانەی خوالێخۆشبوو بکر اغا.
٢٠-چایخانە ی خوالێخۆشبوو ئۆمەری چایەچی.
٢١-چایخانەی حمید مام حسین.
٢٢-چایخانەی خوالێخۆشبوو قادر مام حسین.
٢٣-چایخانەی حوێز نادر عەجەم.
٢٤-چایخانەی بەگزادە مام عەبدە.
٢٥-چایخانەی خوالێخۆشبوو حمدامین عباس.
٢٦-چایخانەی خوالێخۆشبوو کاکە سور عەبداغا.
٢٧-چایخانەی نیهاد واحد ئاشەوان.
٢٨-چایخانەی خوالێخۆشبوو کاک محمد عبدالله گەمحان.
٢٩-چایخانەی خوالێخۆش بوو سمایل عەرەب لە ئیستیلاک بوو لەسەرەتای شەستەکان.
٣٠-چایخانەی رشید مام قادر.
٣١-چایخانەی زاهیر ئەسعەد جافە.
٣٢-چایخانەی خوا لێخۆشبوو فتاح حکیم.
٣٣-چایخانەی کریم سلیم.
٣٤-چایخانەی صلاح مام عەبدە.
٣٥-چایخانەی خوالێخۆشبوو ئافە برای تاهیر تۆفیق.
٣٦-چایخانەی زاهیری تەنیشت کەباب برایان.
٣٧-چایخانەی کەو بازان خاوەنەکە ی کاک فریاد.
٣٨-چایخانەی ئاراس کاک مجید.
٣٩-چایخانەی بەهزاد عبدالله سور.
٤٠-چایخانەی خوالێخۆشبوو مام تەها.
٤١-چایخانەی خوالێخۆشبوو بەکر مام قادر.
٤٢-چایخانەی خوالێخۆشبوو عومەری چایەچی.

٤٣-چایخانەی محمد فایەق ئاغا مستەفا.
٤٤-چایخانەی حاجی واحد چایەچی.
٤٥-چایخانەی وەستا فەتاحی چایەچی.
٤٦-چایخانەی حەمەدی کەریمی لەسەر خانی قادری یاسینی بووە جگە لەمانە هەندێک چایخانە هەبوون لەکۆتایی پەنجاکان لەهاوین دەکرانەوە دوای عەسر تا درەنگانی شەو.
١-چایخانەی خوالێخۆش بوو کاک قادر فقێ گورێ لەکانیلە لە ناو شیوی رەزان.
٢-دوی کاک قادر خوالێخۆشبوو کاک فائق اغا مستەفا لەکانیلە چایخانەی داناوە.
٣-چایخانەی خوالێخۆشبوو مام تەها لەژێر جسری ئازادی.
٤-چایخانەی خوالێخۆشبوو سابیری قەساب لەناوباخچەکەی سەر جسری ئازادی.
٥-چایخانەی خوالێخۆشبوو بەکر مام قادر لە پشت حەمامی پیسکان.
٦-چایخانەی بەکر عمر ئاغای شەوگێر لە سەردەرگای خۆشناوان دوای ئەو خوالێخۆشبوو زاهیر مام رشید مام یحیا لەهەمان شوێن چایخانەی کردەوە پێیان دەگوت چایخانەی سەرقەبرۆکان.
٧-چایخانەی خوالێخۆشبوو فتاح حکیم لەتەم تەمان بوو ئێواران دوای عەسر گەنج و پیر روویان لەم چایخانانە دەکرد پشووەکی باشیان دەدا ئێوارانی شیوی رەزان و سەرجادەی رەزان هەر وەک حاجی قادر دەڵێ: نموونەی جەنەتە شیوی رەزانی.
عاسی شاعیریش دەڵێ:
من کە کۆیەم سەیری باغ و مەنزەرەم
گەر بێ تو لوبنان من ببێنێ بێ شک دەگرێ وەرەم
بەڵام مەخابن بۆ جوانی شیوی رەزان و جوانی سروشتی کۆیە بۆتە وێرانە دوای راپەرین کاک دلێر عثمان عەونی لەزاری مامۆستا

احمد دلزار دەگێرتەوە کەکاتی خۆی لەکۆیە ژنێک بە ناوی زەینەبە رەق چایخانەی داناوە.

جگە لەمانەی کە باسمانکردن چەند چایخانەیەکی دیکەی کۆییان هەبوو لەچنارۆک.

١-چایخانەی صابر مەلا رەئوف جەلی زادە.

٢-چایخانەی خوالێخۆشبوو مامۆستا عزیز حسین.

٣-چایخانەی خوالێخۆشبوو اسماعیل خەیات.

٤-چایخانەی خوالێخۆشبوو فاروق جمال.

٥-چایخانەی خوالێخۆشبوو عمر حسن.

زۆرکەس بۆ پشوو ئێواران دەچووە چایخانەکانی چنارۆک تەختەو تە پلەی چاخانەکان زۆر سادەبوون لەلایەن دارتاشەکان دروست دەکرا هەندێ جار سێ پای چایخانەکان پلێت بوو لای تەنەکەچی دروست دەکرا قۆریەی شوشە لە چایخانەکان بەکاردەهات بەڵام لای وەستا تۆق بەندیان دەکرد بۆ پاراستنی لەشکان ئەمانە بەم کارە هەڵدەستان.

١-وەستا عثمانی مامم بوو.

٢-وەستا احسانی مام عثمان.

٣-وەستا نصرالله.

وە سەماوەرەکانیشیان لای ئەو وەستایانە کە ئاماژەمان پێکرد دروست دەکرد، چایەچی رەژوویان بەکاردەهێنا بۆ چالێنان چونکە نەفت کەم بوو غاز هەرنەبوو.



وەستا محمد عبدالله



## زنجرەی بیست و نۆ

### (پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیەی جاران)

یەکێک لەپیشەکانی دیکەی شاری کۆیە پیشەی قەسابی بوو چەند بنەمالەیەک ئەم کارەیان ئەنجام دەدا جاران ئاژەل نرخی زۆر هەرزان بوو کیلۆی گۆشتی بەرخ لە پیش قەنارە بە دوو درهەم بوو خەلک گۆشتی بزن و رەشەولاخیان زۆر بەخەراپی دەخوارد باوەرتان هەبێ ئەگەر قەساب رەشە ولاخی سەر ببریبایە دەبوو رۆژێک پێشتر قەسابەکە ریکلامی بۆ بکردبایە زۆرجار خوالێخۆشبووان مام حەمەشین و مام صالحی قەساب بە بازاردا دەهاتن هاواریان دەکرد دەیان گوت هەرکەسێک تالبی شفتە و کفتەیە بەیانی جوانەگایەکی قەلەو سەردەبرین مالی کفتەو شفتەیە ئەوەی مەبەستی بوایە دەچووە بەردوکانی مام صالح باوکی کاک شوان پیاوێکی جوان و رێک پۆش بوو نەختێک دەلەنگی هەمیشە گۆچانی پێ بوو جاران کەلەشە حەیوان لە قەسابخانان بەولاخ دەگوازراوە بۆ دوکانی قەسابەکان کاک مەحمود گوێ درێژەکی باشی هەبوو تەختەیەکی لەسەر پشتی گوێ درێژەکە دانابوو کە دە قولابی گۆشتی پێوە بەسترابوو کەلەشەکانی بەم لاو ئەولای تەختەکە شۆر دەکردەوە دوکان بەدوکان کەلاشەکانی دابەش دەکرد جاران تاکۆتایی پەنجاکان قەسابخانە لە شوینی گەراج بوو بەرانبەر باخچەی فریشتە لەدوو هۆدەی گچکە پێک هاتبوو دوایی لەسەرەتای حەفتاکان گوازراوە نزیک باخچەی مام قادر دزەیی چەند سالێک پێش ئێستا قەسابخانەیەکی مۆدێرنی دیکە کراوەتەوە لەسەر رێگای تەق تەق ئەمەش ناوی قەسابەکانە:

١-خوالێخۆشبوو کاک مغدید.

٢-خوالێخۆشبوو کاک عزیز مغدید.

٣-خوالێخۆشبوو ابوبکر قەساب.

٤-خوالێخۆشبوو محمود فەقێ.

٥-خوالێخۆشبوو حمید فەقێ.
٦-خوالێخۆشبوو سەعید ابوبکر.
٧-خوالێخۆشبوو خارە أبوبکر.
٨-خوالێخۆشبوو واحد أبوبکر.
٩-خوالێخۆشبوو سۆفی محمد.
١٠-خوالێخۆشبوو خدر سۆفی محمد.
١١-خوالێخۆشبوو سابیر سوفی محمد.
١٢-خوالێخۆشبوو مغدید سۆفی محمد.
١٣-خوالێخۆشبوو خالد سۆفی محمد.
١٤-خوالێخۆشبوو عمر خدر.
١٥-خوالێخۆشبوو فەقێ عثمان.
١٦-خوالێخۆشبوو شەهید حەمە تاهر.
١٧-خوالێخۆشبوو عەباس قەساب.
١٨-خوالێخۆشبوو نادر قەساب.
١٩-خوالێخۆشبوو شفیق نادر قەساب.
٢٠-خوالێخۆشبوو حەمە جەمباراش.
٢١-خوالێخۆشبوو عمر حەمە جەمباراش.
٢٢-خوالێخۆشبوو عثمان حەمە جەمباراش.
٢٣-خوالێخۆشبوو مام کریم شانە باوکی شەهید مامۆستا حمید.
٢٤-مام صالح باوکی کاک شوان.
٢٥-خوالێیخۆشبوو نادر صابر سۆفی محمد.
٢٦ -خوالێیخۆشبوو رەشید قەساب.
٢٧-جەنگی سعید.
٢٨-فریاد سعید.
٢٩-خوالێخۆشبوو کاک جەمال لای کاک مەغدید کاری دەکرد.
گۆشتی لەسەر تریانە دادەنا دەی گەراند بۆ فرۆشتن بەنرخی هەرزانتر چونکە سەلاجە نەبوو گۆشتی تێدا هەلگرن

ئەمەی سەیرو سەمەرەبوو زۆرجار کاک مغدید لە جەمال تورەدەبوو بەتایبەتی ئەوکاتانەی کە جەمال گۆشتی نەفرۆشتبایەو هێنابایەوە کاک مەغدید دەیکرد بە هەراو پشتی ملی جەمالی دەگرت و بلندی دەکرد و بەقولابی گۆشتەکەی دەکرد جەمالی قور بەسەریش وەک کێشکە دەلەرزی و هاواری دەکرد ناچار جیرانەکان بەهانای جەمال دەچوون و گۆشتەکەیان بۆ ساغ دەکردەوە مام مەغدید جیرانمان بوو زۆر ئاشنا بوو لەگەل باوکم مامەلەشیان پێکەوە هەبوو هی پێستە.

٣٠-خوالێخۆشبوو کاک عزیز مغدید جگە لەکاری قەسابی بەلێندەری دابینکردنی گۆشت بوو بۆ سەربازگەکان.

٣١-خوا لێخۆشبوو وەستا احمد.

ئێستا نەوەی قەسابە کۆنەکان بەردەوامن لەسەر پیشەی باوک و باپیرانیان جاران باری ژیانی قەسابەکان باش نەبوو بە پارەی پێست و ریخەلۆک کاسبی خۆیان دەکرد چونکە پێست نرخێکی زۆر باشی دەکرد دەبوو کریاری برێک پارەی بدابایە بەقەساب بۆ ئەوەی کاری پێ بکات وە رۆژانە قەسابەکە دەبووایە پێستەی بدابایە بەو بازرگانەی کە پارەکەی لێ وەرگرتووە تا ئەوکاتەی پارەکەی پر دەکردەوە متمانە هەبوو قەسابەکانی کۆیە بەبنەمالەی خەسرەوی ناسراون بنەمالەیەکی خۆشەویست و بێ کێشەبوونە.





## زنجیرەی سی

### (پیشەوەرە کۆنەکانی جارانی کۆیە)

لەمەوپێش ئاماژەمان بەوەکرد کەشاری کۆیە پێگەیەکی بازرگانی گرنگی هەبوو بەم هۆیەوە کاروان و میوان لەهەموو شوێنێک روویان تێدەکرد ئەم هەموو میوانە پێویستیان بەخواردن و چێشتخانە و کەبابخانە هەبوو لەشاری کۆیە چەند چێشتخانەیەک هەبوو.

١-جێشتخانەی خوالێخۆشبوو رینگە لەسەر جادەبوو بەدیواری مزگەوتی گەورەوە نووسابوو لەدەرگای بازار رینگە پیاوێکی خۆشەویست بوو هەمیشە مەندیلەکی سپی لەسەر بوو نەفەرێک برنج و مەرەگەو گۆشت دوو درهەم بوو.

٢-چێشتخانەی خوالێخۆشبوو حەمەعەبۆ و حسین حەمەعەبۆ جگە لەبرنج و مەرەگە گیپەشیان دەفرۆشت لەگەل جگەر دوکانیان لەتەنیشت ئیستیلاک بوو.

٣-چێشتخانەی وەستا حەوێزی برای کاک رینگەی جگە لەمانە لەحەفتاکان ئەمانە چێشتخانەیان دانا.

١-خوالێخۆشبوو کاک حوێز مطعمچی.

٢-خوالێخۆشبوو قادر اغا.

بەلام لەکۆیە کەبابخانەی زۆرنایابی لێ بوو:

١- کەبابخانەی وەستا حمدامین وەستا صالح کورەکانی کاک خالد و کاک وشیارو کاک دلشاد یارمەتی دەری باوکیان بوون.

٢-کەبابخانەی خوالێخۆشبوو وەستا رسول کاک قادری کوری یارمەتی دەری بوو.

٣-کەبابخانەی وەستا قادر کاک اکرمی کوری یارمەتی دەری بوو هەرسێ کەبابخانە لەریزەک بوون لەنزیک خانی گەورە.

٤-کەبابخانەی خوالێخۆشبوو کاک کاوەیس وەستا مەولودی برای یارمەتی دەری بوو ئەم کەبابخانەیە لەتەنیشت دەرگای قەیسەری کۆن بوو زۆر بەناوبانگ بوو.

٥-کەبابخانەی خوالێخۆشبوو مام اسماعیل کاک زریان و کاک کەمالی کوری یارمەتی دەری بوون.
٦-کە بابخانەی کاک زاهیر علی.
٧-کە بابخانەی کاک سلێمان لەنزیک بانک.
٨-کەبابخانەی خوالێخۆشبوو احمد وەیسی لەنزیک مزگەوتی خادم سەجادە.
٩-کەبابخانەی خوالێخۆشبوو مام ئۆمەر.
١٠-کەبابخانەی خوالێخۆشبوو قادر اغا.
١١-کەبابخانەی برایان کە خاوەنەکەی کاک رزگار عبدالله وکاوە عبدالله بوو.
١٢-کەبابخانەی کاک سعید.
جگە لەمانەی کەباسمان کرد جگەر چی هەبوون:
١-خوالێخۆشبوو وەستا علی جگەرچی.
٢-خوالێخۆشبوو محمد جگەرچی.
نرخی نەفەرێک جگەر دوو درهەم بوو هاوشێوەی کەباب جاران کەبابچی لەبەرچاوی خەلک گۆشتی خۆمالی لەقیمە دەدا بۆیە تام و چێژی خۆی هەبوو بەداخەوە بەشی زۆری کەبابچییەکان لەژیاندا نەماون جاران هەبوو لەشوێنی زۆر دوور دەهات بەمەبەستی کەباب خواردن.



## زنجیرەی سی و یەکەم

### (ڕەمەزانی کۆیەی جاران)

ڕەمەزانی جارانی کۆیە تایبەت مەندی خۆی هەبوو هەندێک داب و نەریت پەیرەو دەکرا چێژی دەدا بەرەمەزان کە ڕەمەزان دەهات خواپەرستی ڕێزگرتن لە گەورەیی ئەم مانگە دەگیرا هەر لە یەکەم شەو لەسەرجەم مزگەوتەکان دەنگی کەبارو ستاییش ئایینی بەرز دەبۆوە بەڵام ئەم کارە زووئەنجام دەدرا لە یەکەم شەو لە دوای سەعات یەکی نیوەشەو خوالێخۆشبوو مام عەزیز زەینەل و کاک جەمال عەزیز خوالێخۆشبوو حەمە عەبۆ و حسینی کوری بەخۆیان و دەهۆلەکانیان لەماڵەکانیان دەهاتنە دەرەوەو بەپێیان بەناو کۆلانە تەنگەبەرەکانی کۆیە دەرۆیشتن بەدەم کوتانی دەهۆلو زورنا ژەنین تام و چێژەکی زۆر خۆشیان دەدا بەم مانگە پیرۆزە جاران خەلک بەم دەهۆل و زورنایە هەلدەستاوە بۆ پارشیو خواردن گەلێک جار دەهۆل چیەکان ئەگەر بیان زانیبا خانەوادەیەک بەخەبەر نەهاتووە لەبەر دەرگای ئەم ماڵە باشتر دەهۆڵەکەیان دەکوتا ئێمە مندال بووین زۆر خۆشحال دەبووین کە گوێمان لەدەنگی دەهۆل دەبوو لەپشت دەرگای حەوشە رادەوەستاین تا دەهۆل دەهات و سەیرمان دەکرد خەنی دەبووین بەچاوی خەوالو.

ئێمە مندال بووین ڕۆژومان لەسەر نەبوو دایک و باوکمان دەیان گوت هەتا بەیانی یا هەتا نیوەرۆ بە ڕۆژوو بن دوایی نان بخۆن ڕۆژووەکەتان بۆ گرێ دەدەین خوزگە دایک و باوکمان مابووایە بۆ ئەوەی وەک جاران ڕۆژووەکانیان بۆ گرێ دابایە لەمەش خۆشتر کاتی دوای عەسرو ئێواران بوو دوای نوێژی عەسر مەلا وتارو وەعزی دەخوێندەوە لە مزگەوتی گەورە بەسەدەها مندال و لاوو پیر دەهاتنە مزگەوت بۆ گوێ گرتن لەوتاری مامۆستا بەڵام ئەوەی سەیرو خۆش بوو ئەم مندالانە لەسەربانی مزگەوت دادەنیشتن و لەسەر ڕۆخی دیواری مزگەوت لاقمان شۆر دەکردەوە گوێمان لەوتارەکە دەگرت

دوای تەواو بـوونی وتـار ئەم حەشـاماتە بـلاوەیـان دەكـرد دەچـوونە ئیستیلاک لەم شوێنە هەموو جۆرە شیرنەمەنیەکی لێبوو بەتایبەتی.

خوالێخۆشـبوو صـابر حەلـوا هەمـوو جـۆرە حەلـواو چـوکلات و شەکرۆکەو پاقلاوەیەکی لەسەر مێزێکی گەورە دانا بوو چەند گلۆپەکی داگیرساندبوو دەیکرد بە چراخان هاوار هاواری کاک صابرو جموجۆلی منـدالان دیمەنێكـی جـوانی بەرەمەزان بەخشـی بـوو هەر منـداڵەی عـانەیەكـی مـووچەی رۆژانەی خـۆی خەرج دەكـرد شـیرنەمەنی وەک پاقلاوەو لـوقم و شـەکرۆکە ی تـرش و شـیرنی پێ دەکـری و دەمـان خستە باخەل و گیرفان دوایی دەچووینە سـەر قادرمەکانی کۆنە نـادی کۆیە لەتەنیشت کۆنە سەرابوو لەسەر فلکە هەموومان چاوەرێ ی تۆپ تەقانی خوالێخۆشبوو مام حەمە عەبۆ بووین.

ئەوەی سـەیـرو سـەمەرەبوو مەلا عبـدالرحمن پـێش بانـگ بەپێنج دەقیقە دەهاتە سەر قادرمەکان لەناومنداڵەکان رادەوەسـتا کەکاتی بانگ دەهـات مەلا عبـدالرحمن مەنـدیلەکەی لەسـەری دەهێنـا خـوارەوە چەنـد جارێک رای دەوەشاند کە ئەم کارەی ئەنجام دەدا حەمە عەبۆ لە گردی قشـلە لێـی دیـار بـوو یەکسـەر تـۆپەکەی وەسـتا رەجەبـی دە تەقانـد ئەمەی سە یربوو مەلا چەند جارێک سەعاتە زنجیردارەکەی لـە گیرفان دەردەهێنـاو تەماشـای دەكـرد منـدالانیش تێكـرا هاواریـان دەكـرد مەلا تەواوە بایـدە ئەویـش دەیگـوت سـەبربگرن مـاویەتی کە مەلا مەنـدلی بـادەداو گـرمەی تـۆپ دەهـات منداڵەکان شـیرنەمەنییەکانیان لەگیرفـان دەهێنا دەرەوەو بەدەم گەرانەوە بۆ ماڵ دەیان خـوارد تۆپی مـام حەمـە عەبۆ بەکەونە پەرۆ و پێلاوی دراو دەی ئاخاند بەدارێکی ئەستور جوان دەیپەست و هەندێک باروتی لەسەر کونی پشتەوە دادەنا بەدارێکی درێژ ئـاگری لەبـاروتەکە نزیـک دەکـردەوەو گـرمەی دەهـات لەکـۆیە هەمـوو ماڵێک گوێ ی لەدەنگی تۆپ دەبوو فتاریـان دەکردەوە ئەم تۆپە لەلای ماڵی خۆمان لەبەر دەرگای دار الضیافە داندرابوو لەلایەن سەربازەکانی رژێمی لەناو چوو ئەم شوێنە بارەگا بوو بەڵام بە داخەوە لەدوای سـالی ١٩٨٩ ئەم تۆپە دزرا لەلایەن سەربازەکانی رژێمی لەناوچوو.

لەرەمەزاندا هەندێک خواردن دروست دەکرا وەک لوقمە قازی زرۆبی شلکینە کە لەناو شیلە شەکر دایان دەنا زۆر خۆش و بەتام بوو کابانی ئێستا نازانن دروستی بکەن لەمالان پارشیو ژنەکان هەویریان دەشیلاو لەبری خەمیرە هەویر ترشیان تێدەکرد گەرم تە شتۆکە هەویریان دادەپۆشت وەختی عەسر لەسەر خوانە پانیان دەکردەوەو دەیانکردە ئەستوکە بەروون و کونجی دوایی لەسەر تریانەیان دادەناو دەمان خستە سەر سەرمان و دەمان بردە لای فرنی نانەواو بۆ سورکردنەوە ئێوارەو پار شیو دەمان خوارد بەراستی بەتام و چێژ بەشەوانی رەمەزان خەلک لەدەرەوە بوون بەتایبەتی خەیاتەکان کاریان دەکرد بۆ جل و بەرگ دروون بۆ ئامادەباشی بۆ جەژن لەکاتی یەکەم رۆژی جەژن دەهۆل و زورنا دەگەرا مال بەمال گەرەک بە گەرەک هەر ماله شتێکی بەخشیش دەدا بە دەهۆلچی لە یەکەم رۆژی جەژن جیران و خزم سەردانی یەکتریان دەکرد هەرکەسێک عاجزی هەبووایە ئاشت دەکرانەوە لەلایەن ردێن سپی و مەلا ئاینییەکان.

بەراستی رەمەزانی جارانی کۆیە تام و چێژی خۆی هەبوو دەهۆل و زورنا ژەنەکان وەک پیشەیان لێ هاتبوو لەکاتی ئاهەنگ و ژن گواستنەوە بەشداریان دەکرد خۆشی و تام و چێژیان بەخۆشی و هە لپەرکێکان دەبەخشی جگە لەمانەی کەباسمانکردن سەرجەم چایخانە و چێشتخانەکان دادەخران مۆلەت نەبوو بۆ کردنەوەی خواردنگەکان رەمەزان رێزی لێدەگیرا دوورۆژ پێش هاتنی رەمەزان بانگەوازیان دەکرد لەرادێو هەرکەسێک مانگی دیت با خەبەری نزیکترین دادگا بدات بۆخۆشیتان لەکۆیە چەند برادەرێک هەبوون هەمیشە لەناو شیوی رەزان ئارەقیان دەخواردەوە کە پێکهاتبوون لە:

١- خوالێخۆشبوو خورشید رفعت عەلاو ناسرابوو بە خورشەی سایەق.

٢- خوالێخۆشبوو جلال مام قادر.

٣- خوالێخۆشبوو عمر حاجی کاکە امین.

٤- خوالێخۆشبوو کاک غفور بایەزید.

٥- خوالێخۆشبوو کاکە سواری باخچەوان.

لەرەمەزانی سەرەتای شەستەکان شەوی پێش رەمەزان هەر پێنج بە چەپلەو گۆرانی هەتلی لینجان هەتلی لینجان لەناو شیوی رەزان دێنەوە بەرەو شار راست دەچنە مالی حاکم لە دەرگا دەدەن حاکم دێتە دەرەوەو دەلێ فەرموون هەرپێنجیان دەلێن جەنابی حاکم مانگمان دیتووە جەنابی حاکم دەلێ کەنگین مانگتان دیتووە هەموویان دەلێن سێ رۆژە حاکم بەپۆلیسەکانی دەلێ بیان بەن بۆ سجن هەتا دوای جەژن تەوقیفی کردن هەقی شایەدی درۆ حاکم زانیاری هەبوو لەسەر ئەم جەماعە تە مەشروب خۆرە خودا بەرەحمی خۆی رەحمیان پێ بکات.



## زنجیرەی سی و دوو

### (پیشەوەرەکانی کۆیە جاران)

هەروەک باسمانکرد هەموو جۆرە پیشەوەرێک لەشاری کۆیە هەبووە بەرگدرووش یەکێک بووە لەپیشە بەناوبانگەکانی ئەم شارە، خەیاتە کۆنەکانی کۆیە هەموو جۆرە جل و بەرگێکی پیاوانەو ژنانەیان زانیوە کەبیدروون جل و بەرگی پیاوانە وەک کورتەک و شەروار، مراد خانی، دیموکراتی، رانک و چۆغەری مەرەز، رانک و چۆغەری قوماش، کراس و شەروار، کورتەکی بەلۆکە بۆ بەسالاچووان، کورەجەی ژنە رەوەند، جگە لە بەرگدرووی پیاو هەندێ ژن کاری خەیاتیان دەکرد بەدەست کەواو سەلتەو کراسی ژنان و جلکە بووکیان دەدووری بەرگ درووەکان زۆربەیان دوکانیان لەناو هەردوو قەیسەری بوو:

١-وەستا رەفیق لە قەیسەری کۆن بوو.

٢-خوالێخۆشبوو قادر رەواندزی.

٣-خوالێخۆشبووعزیز قادر رەواندوزی.

٤-خوالێخۆشبوو حاجی عمر حاجی احمد.

٥-خوالێخۆشبوو مام عبدالله دەرزی.

٦-خوالێخۆشبوو عەبدە حاجی قارەان.

٧-خوالێخۆشبوو حمدامین بەگ.

٨-باقی هیرانی.

٩-صباح مام حسین.

لەقەیسەری نوێ ئەم بەرگ درووانە هەبوون.

١-خوالێخۆشبوو مام رەشاد.

٢-خوالێخۆشبوو جلال حمد بەگ ناسراو بەجلال مختار.

٣-خوالێخۆشبوو وەستا عبدالرحمن مەلا رەئوف باوکی خوالێخۆشبوو کاک امیر.

٤-خوالێخۆشبوو وەستا مستەفا سەردۆری.

لەناو بازاریش ئەم بەرگ درووانە هەبوون:

١-خوالێخۆشبوو اکرم عمر دەباغ.

٢-خوالێخۆشبوو مجید حاجی عمر.

٣-خوالێخۆشبوو وەستا رشاد عبدالله خەنجەرچی.

٤-خوالێخۆشبوو مجید فقێ عەولا.

٥-خوالێخۆشبوو وەستا محی الدین قەبرهەڵکەن.

٦-وەستا طاهر محی الدین.

٧-وەستا صدیق محی الدین.

٨-مامۆستا دلاوەر مەجید فەقێ عەولا.

٩-خوالێخۆشبوو عثمان عباس.

١٠-خوالێخۆشبوو انور حەمە علی.

١١-حەمە علی فقێ برایم.

١٢-وەستا شوکر مام فتحی.

١٣-وەستا مامە مام طە.

١٤-وەستا ابرها.

١٥-وەستا موفق ابرها.

١٥-سعید ابرها.

١٦-وەستا عزیز مام عبدالله.

١٧-خوالێخۆشبوو وەستا صابر سعید.

١٨-خوالێخۆشبوو صابر مصطفی صابر یاعاسمە.

١٩-خوالێخۆشبوو شادمان جمال.

٢٠-وەستا ئاسۆ عەبدالرحمن.

٢١-وەستا اسماعیل جلال.

٢٢-خوالێخۆشبوو اسماعیل حاجی قادر.

٢٣-سەرباز اسماعیل.

٢٤-وەستا دلدار اسماعیل.

٢٥-وەستا عمر حاجی حسن.

٢٦-وەستا دلشاد قادر.
٢٧-وەستا كمال اسماعيل.
٢٨-وەستا مامە.
٢٩-خوالێخۆشبوو كاك معصوم.
٣٠-حميد عەبدە حاجی قارەمان.
٣١-خوالێخۆشبوو مجيد عەبدە حاجی قارەمان.
٣٢-وەستا ڕێنوار اكرم.
٣٣-وەستا فتاح مەلا عەبد.
٣٤-وەستا سەرکەوت.
٣٥-شۆرش حاجی عمر.
٣٦-خوالێخۆشبوو وەستا صابر مام طاهر.
٣٧-خوالێخۆشبوو صديق مام طاهر.
٣٨-وەستا جەنگی صديق.
٣٩-خوالێخۆشبوو وەستا شفيق عبدالرحمن.
٤٠-وەستا مشير شفيق.
٤١-خوالێخۆشبوو سەعيد حاجی مستەفا چەلەبی.
٤٢-خوالێخۆشبوو سابير مەلا رەئوف.
٤٣-خوالێخۆشبوو شەهيد يوسف حنا.
٤٤-خوالێخۆشبوو عبدالرحمن فقێ عەولا.
٤٥-خوالێخۆشبوو شێخ سەلاح کاکە سالح.
٤٦-خوالێخۆشبوو وەستا رەئوف.
٤٧-خوالێخۆشبوو وەستا مستەفای حاجی قارەمان.
٤٨-وەستا ئەفەندی خەيات.
٤٩-کەيفی سلێمان قاوەچی.
٥٠-خوالێخۆشبوو حەميد کاکە ئەسوەد.

جگە لەم وەستا کۆنانە هەندێک وەستای گەنج ئێستا پەيدابوونە وەک وەستا (ئالان صديق، وەستا کاوە اسماعيل، وەستا رێکار شوکر،

وەستا هێمن شوکر، ڕێبوار شوکر وەستادیاری پێشرەو. لە کۆیە وەستا عەزیزی ملا واحد جلکی بووکی دەدوری زۆر بەتەمەن بوو خوالێخۆشبوو نەنکم نوریە، سەعدیە محمد مەلا عاسی، زێبا محمد مەلا عاسی، بەرگ درووەکی باش بوون بۆ ژنان).

یا قدری مام عثمان، یا حەسیبە عمر، یاحمدیە حسن ملا احمد، یاعەیشێ رشید میران خێزانی صدیق چایەچی، یا حمدیە عەبدە سلام، یازەکێ خێزانی مام عمر پۆلیس، یاحەبیب دایکی وەستا صالحی، یافاتم خوشکی وەستا صالح، یا سەبیحە حەمدامین رەسول کە لە گەرەکی بەفری قەندی بوو.ئەمانە سەلتەیان دەدوری بەدەست بەڵام بەداخەوە ئەم بەرگ درووانە نەماون مەکینەی بەرگدرووەکان بەپێ کاری دەکرد هی ژنانیش بە دەست دەیان سوراند مەکینەی بەرگدرووەکان ئەم مارکانەبوون(سونگەر، باف، جۆکی، برازەر، پەپولە) بەرگدرووەکان ئوتووێ رەژوویان بەکار دەهێنا جاران لادێ یەکان باوەریان بە بەرگدرووەکان لاواز بوو هەندێک جار کە قوماشیان دەبرد بۆ لای بەرگدروو دەیان گوت وەستا بە کێشانم لێ وەربگرە بە کێشانم بدەوە لە بازار ئەم دیاردەم دیتوە.







وەستا ئەکرەمی خەیات

## زنجیرەی سی و سێ یەم

(پیشەوەرەکانی جارانی کۆیە)

هەقمە شانازی بکەم بەشاری کۆیە چونکە هەمیشە سەر قافلەو پێشەنگ بووە لەداهێنان و پیشەوەری شارەزاو پشت ئەستور بووە بەرۆلەکانی بۆدابینکردنی کەل و پەل و پێداویستییەکانی لەم شارە لەدێر زەمانەوە پیشەوەری زێرنگرو زیوی لێبووە لەوانە:

١- خوالێخۆشبوو مغدید مولود.
٢- خوالێخۆشبوو کمال طاهر مەلاحبیب.
٣- زرار طاهر مەلاحبیب.
٤- خوالێخۆشبوو عبدالرزاق زێرنگر.
٥- خوالێخۆش بوو جلال حمدامین.
٦- خوالێخۆشبوو کمال حمدامین.
٧- مامۆستا مجید حمدامین.
٨- وەستا اکرم محمود.
٩- وەستا ئازاد حاجی عمر.
١٠- ئاراس مغدید مولود.
١١- ئازاد مغدید مولود.
١٢- کاک سرود عزیز مغدید.
١٣- کاک سەرکۆ عزیز مغدید.
١٥- کاک نەوزاد وەستا رشید.
١٦- کاک ئاسۆ وەستا بکر.
١٧- کاک شفیق زێرنگر.

لەدایکم بیستووە کە جولەکەکانی کۆیە ئەم پیشەیان کردووە لەوانە:

١- شەلکە.
٢- دانیال.
٣- موسای صالحۆکی مۆشکەی.
٤- بلە خوارە.

زێرینگرەکانی کۆیە ئەم جۆرە زێرانەیان دروست دەکرد (ملەگۆ، گوارە، بلبلە، گەردەن لغ، تاسە سەر کلاوی زێر، بازن، سێلولە، قەنەفربەند، گۆبەرۆک، حجیل، پشتێنی زێر، ماشالله بۆ نیچەوانی منداڵی ساوا لەگەل مۆریە شین، عاشق بەند).

نرخی زێر لەشەستەکان دینارو نیوەک بوو ئێمە دوکانمان لەتەنیشت کۆنە کتێبخانەی کۆیە بوو جل و بەرگی ژنان و بوکانمان دەفرۆشت زێرمان دەکری بەم نرخە بەسەد فلس قازانج دەمان فرۆشتەوە لەدوای خۆماڵی کردنی نەوت لە ساڵی١٩٧٣نرخی زێر بەرزبۆوە بوو بەسێ دینار لە ١٩٧٦بوو بەشەش دینار لەبیرمە لە١٩٨١شەری عێراق و ئیران لە گۆرێ بوو من لە تورکیا بووم زێر بوو بە١٥/ دینار بەم شێوەیە وردە وردە بەرز بۆوە عەیاری زێری کۆیە هەژدەبوو جاران زۆر فروفێل لەزێر دەکرا لەناو بازار کێشە پەیدا دەبوو زێری جاران مۆرو تەمغەی نەبوو بۆیە ئەم کێشانە رووی دەدا ئافرەت کەزێری دەکری کەم بەخۆیەوە دەکرد ئەگەر زۆر پێویست بوونایە دەیانفرۆشت لەکاتی فرۆشتن فرو فێلی زۆر ئاشکرا دەبوو دوای ١٠/یا١٥ساڵ. جاران زێر بە مسقال پێوانە دەکرا نەک بەغرام وەستا کەمال وەستا عبدالرزاق کاری زیویان دەکرد.



## زنجەری سی و چوارەمین

### (پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیەی جاران)

لە سـالآنی پەنجاکـان هەر کەسـێک دامەزرابـا لەدام و دەزگاکـانی حکومەت دەیان گوت پیاوی حکومەتە بەیانی کە هەلدەستێ پارەکەی لەبن بالیف بۆ دانراوە کەسیش لە خۆبایی نەبوو هەرکارێک کە بژێوی ژیـانی دابـین بکردبـایە ئەنجـامی دەدا بەمەرجێـک کەسـایەتی لەکەدار نەکردبا سەیرە لەم رۆژگارە گەنجەکانمان پێیان شـەرمە لەزێدی بـاوک و باپیرانیان کاربکەن بەلآم ئامادەیە لـە هەنـدەران هەمـوو کارێـک بکـات هەمووماـن بـاش دەزانـین کـە کـۆیەی جـاران تاسـەرەتای شەسـتەکان پێکهـاتبوو لەچـوار گەرەک بایزاغـا، هەواوان، بەفـری قەنـدی، قەلات، کۆلانەکانی کۆیەی کۆن تەنگەبەربوون بۆ گواستنەوە گوێدرێژ و هێستر بەکاردەهات جگە لەمانەی کەباسمانکرد سەیارە زۆرکەم بوو سـەیارەی خۆل و خاشـاک هەرنەبوو لەسـەرەتای هەشـتاکان لەشـارە گەورەکـان وردە وردە پە یدابوو.

کەواتە بابزانین بەچ رێگایەک خۆل و خاشاک کۆ دەکراوە لەمالانی گەرەکە تەنـگە بەرەکـان جـاران خەلـک خـۆل و خاشـاکی لەتەنەکەی روونی بەتـال دەکرد لەبەر دەرگـا دایدەنا هەمـوو رۆژ زبلکێش دەهـات گوێدرێژەکی توندو تۆلی پێ بـوو شـەلتەیەکی لەسـەر پشـت بـوو زبـڵ کـێش بەزەوق مـاڵ بە مـاڵ دەرۆیشـت زبـڵ و خـۆل و خاشـاکەکانی بەتەنەکەوە بلند دەکرد لەناو شەلتەکەی دەکرد زۆر بە دلسۆزی کـاری خۆیان دەکرد پاک و خاوێنی شاریان دەپاراسـت شـار گەلێک لە ئێسـتا خـاوێن تـر بـوو زبـڵ کـێش هێـواش هێـواش بەکـۆلانە تەنـگە بەرەکـان تێـدەپەری و هـاواری دەکـرد زبـڵ زبـڵ هەر مـالەک زبلـێ لەژوورەوە هەبـووایە دەیهێنـا دەرەوەو دەیـدا بەزبـڵ کـێش خەلکـی بەگشـتی زۆر رێزیان لەزبڵ کێش دەگرت خۆشەویستی گەرەک بوون.

دوای ئەنجامـدانی کـارەکەیـان خـۆل و خاشـاکەکەیان دەبـردە دەرەوەی شـــار هەرکە س بـــۆ لای خـــۆیَ چـــوار پیـــاوی بەرێـــزو

خۆشەویسی خۆل و خاشاکی هەرچوار گەرەکی شاری کۆیەیان کۆدەکردەوە بێ ئەوەی هیچ ئامێرێکی خزمەت گوزاری هاوچەرخی وەک ئەمرۆیان لەبەردەست دابێ جگە لەمە ئێستا کۆمپانیای بابا گروپ بەدەیەها کرێکاریان لەبەر دەستە لەگەل هەموو جۆرە کەلو پەل و سەیارەی خزمەت گوزاری کاری ئەم چوار بەرێزە دەکەن هەزار رەحمەت لە گیانی پاکیان.

١- خوالێخۆشبوو علی سەمەنێ.

٢- خوالێخۆشبوو کاک عبدالرحمن مام کریم.

٣- خوالێخۆشبوو مام نوزی حەلە بەغدایی.

٤- خوالێخۆشبوو کاکە سوری کەناس.

٥- خوالێخۆشبوو مام کەریمی زبل کێش.

٦- خوالێخۆشبوو مام عوسمان کەریم حەمە رۆمی.

جاران شارەوانی مووچەی بۆ گوێدرێژی زبڵ کێش خەرج دەکرد بەڵام ئێستا ئامێری دەمبەر بەکار دەهێنرێت بۆ کۆکردنەوەی زبل و خۆل و خاشاک لەناو کۆلان و گەرەکەکانی کۆیە.



نورە حەلە بەغدایی



## زنجیرەی سی و پێنجەم

هیچ پیشەیەک نیە کەخەلک کاری پێ ی بووبێ لەشاری کۆیە نەبووبێ جاران کەم کەس سەعاتی لەدەست بوو بەدەگمەن سەعاتی سەرمێز لەمالان دەبینرا لەگەل هەموو ئەوانەش لەم شارە سەعاتچی باشی لێبووە ئەوەی سەیرو سەمەرەیە جاران بەشی زۆری ئەوانەی کەسەعاتیان چاک دەکردەوە مەلا یا فەقێ بوون زۆرترین سەعاتی جاران لەجۆری ئۆلمەبوو بەتەمەنەکان و مەلاکان سەعاتی سەنگی سۆف یان بەکاردەهێنا زنجیرەکی پێوەبوو لەباغەریان دەنا بەدووجۆر قورمیشیان دەکرد هەبوو بەکلیل هەبوو بەقورمیش کاری دەکرد لە پیشەوەرەکانی کۆیە.

١- خوالێخۆشبوو نوری سەعاتچی.

٢- خوالێخۆشبوو وەستا نافیری حمدامین بەگ.

٣- خوالێخۆشبوو مەلا طیب مەلا محمد ناسرا بوو بەمەلا بابە شێخ.

٤- خوالێخۆشبوو کاک سعید حەمە قاوەچی.

٥- کاک کاوە سعید قاوەچی.

٦- کاک کاروان سعید قاوەچی.

٧- کاک کامەران سعید قاوەچی.

٨- خوالێخۆشبوو کاک صابر احمد ناسراوە بە صابری سەعاتچی.

٩- خوالێخۆشبوو ملا شفیع.

١٠- خوالێخۆشبوو مەلا رەئوف دوایی چوو بۆ بەغدا کورەکەشی بوو بەسەعاتچی خوالێ ی خۆشبێ کاک عطوف کە خێزانەکەی کچی محمدی مەلا واحید بوو.

١١- خوالێخۆشبوو کەریم رەسول کەبابچی.

١٢- سەربەست عبدالخالق اسعد.

١٣- نەسرەدین زاوای سلێمانی ئاسنگەر.

لەهەندێ لەماڵە دەوڵەمەندەکانی کۆیە جۆرە سەعاتێک هەبوو بەدیوار هەڵدەواسرا چوار دەورەکەی دارەکی قاوەیی جوان بوو میلێکی گەورەی لە ناوەراست هەبوو، هەموو نێو سەعات جارێک جەرەسی لێدەدا پێیان دەگوت سەعاتی چارمە، جۆرە سەعاتێکی گچکەی خر هەبوو چوار چیوەکەی ستیل بوو دوو قورسی لەسەربوو لەسەر مێز دادەنرا قورمیش دەکرا دامان دەناوە بۆ ئەوەی لەخەو خەبەرمان بکاتەوە سەعاتەکانی جاران سویسری بوون.

خزمێکی بەتەمەنم هەیە تا ئێستا سەعاتە ئۆلمەکەی ماوە جاران بۆ زانینی کات پشتیان بە رۆژ دەبەست زۆرجار دایکم رەحمەتی لێبێت دەیگوت درەنگە ئەوە رۆژ گەیشتە ناوەندی ئاسمان.سەعاتمان کەدەبردە لای وەستا دەیگوت خوا بکەم (پانتۆری)نەبی.







## زنجیرەی سی و شەشەم

### (پیشەوەرەكانی كۆیەی جاران)

خودا بەگەورەیی خۆی بە شێكی باشی لە بیرو هۆش بەكۆییەكان بەخشیوە لەهەموو بوارێک توانیویەتی ئەسپی خۆیانی لێ تاوبدەن و سەركەوتووبن لێ ی ئەم جارە باسی پیشەوەرەكانی كۆیە دەكەین لەبواری چاككردنەوەی رادیۆ لە سالی١٩٣٤باوكم یەكەم كەس بووە رادیۆی هێناوەتە كۆیە لە جۆری (فلیپس)تائێستا ماوەو باوكم دەیگوت خزم و جیران دەهاتن شەو گوێیان لێ دەگرت و دەیان گوت ئەوە بۆدەنگی هەیە رەنگی نییە سوپاس بۆ خودا ئەمرۆ دەنگ و رەنگ پێكەوەیە هەندێک جۆری دیكەی رادیۆ پەیدابوو لەكۆتایی پەنجاكان پێیان دەگوت رادیۆی بەگۆلک چونكە پاتریەكی لەگەل بوو هێندەی رادیۆكەبوو دەبوو بەیانیان ئەم پاتریە ببەنە بازار شەحنی بكەنەوە باوەرتان هەبێ نەدەبوو هەموو دەم رادیۆ پێ بكەین دەیان گوت باشەحنی دانەبەزی مندالّی جاران گوێ رایەل بوون لە وەستا بەناوبانگەكانی ئەوكات:

١- خوالێخۆشبوو وەستا مستەفا حاجی كەریم ئاسنگەر باشترین و زیرەكترین وەستای سەردەمی خۆی بوو ئەم وەستایە جگە لەرادیۆ جیهازی لاسلكی بۆ شۆرش چاک دەكردەوە.

٢- خوالێخۆشبوو حمدأمین ملاصابر.

٣- خوالێخۆشبوو كەریم وەستا عمر.

٤- خوالێخۆشبوو مامۆستا كاكە.

٥- كاک نەهرۆ حمدامین.

٦- كەمال اسماعیل كەبابچی.

٧- قوباد عوسمان جگەرە فرۆش.

لەسالّانی كۆتایی شەستەكاندا تەلەفزیۆنی رەش و سپی پەیدابوو كەمحطەكەی لەسەر رێگای بەغدابوو لەكەركوک وەستا مستەفا بوو بەباشترین وەستای تەلەفزیۆن.

لەکۆتایی حەفتاکانیش تەلەفزیۆنی ملەوەن پەیدابوو وەستا مستەفا بوو بەوەستای ئەم جۆرەش هەر جۆرە تەلەفزیۆنەکی پێش کەوتوو پەیدابووبێ وەستا مستەفا سەری لێدەرکردووە. وەستا حمدامین، وەستا نەهرۆ، وەستا کاکە، دەستیان کرد بە چاککردنەوەی تەلەفزیۆن ئەمەی گرنگە وەستا کۆنەکانی جاران دەرچووی هیچ دەستگاو پەیمانگەیەکی ئەلکترونی نەبوون کەچی سەریان لەئیشەکە دەردەچوو بەداخەوە وەستایەکانی جاران هیچیان لەژیاندا نەماون ئێستا کورەکانی وەستا مستەفا لەهەولێر بەردەوامی دەدەن بەپیشەی باوکیان.



وەستا مستەفا حاجی کریم





## زنجیرەی سی و حەوتەم

### (پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیە جاران)

شـــاری شـــاران بـــووم جـــاران بەڵام لەســـایەی ئەم حکـــومەتەی کەرۆلەکانم کرد بەقوربانی ئەمرۆ ژاکاوم لەسادەترین خزمەت گوزاری بـێ بەشـــم کەوتـــوومەتە نێـوان دوو بەرداش هیچیـان بەزەییـان پـێم نـایەتەوەو بەهـی خۆیـانم نـازانن بۆیە هەقمە خۆزگە بەپێش راپەریـن بخوازم دوژمن ئەگەر دەشی کوشتم بەڵام لەخزمەت گوزاری بێ بەشی نەدەکردم و رۆلەکانی برسی و بێکار نەدەکردم و روناکی لەهاوشارانم نەدەبری.

لەپەنجاکان لە شارەکەی حاجی تەنها دوومەکینەی کارەبا هەبوو لەگردی قشلە دانرابوون روناکیان دەدا بەشارەکەی حاجی دەنگ و گرە گری ئەم مەکینانە دەگەیشتە ئەم سەرو ئەو سەری شار خەلکی شار زۆر لەئێستا ئاسودەتربوون پیاوێکی خەمخۆر و پاک بەرێوەبەری دائیرەی کارەبا بوو کە خوالێخۆشبوو کاک مەلا فتاح عزەت جەلیزادە پیاوێکی باریک بوو، کە بەردەوام چاکەت و پانتۆری لەبەر دەکرد هەروەها سیدارەکی رەشیشی لەسەر دەنا، دلسۆزی شاربوو شەوانیش بۆ خزمەت ئۆقرەی نەبوو.

جاران بەرگری شارستانی و شارەوانی و کارەبالە کۆیە تەنها یەک بەرێوەبەری هەبوو دوای کۆچکردنی مەلا فتاح لەحەفتاکان مەکینەکانی کارەبا سوتان ئەندازیارێکی تر خوالێخۆشبێ کاک تۆفیق بادینی کرا بە بەرێوەبەری کارەبا دوای ئەو چەند بەرێوەبەرێکی دیکە هاتنە سەرکورسی دائیرەی کارەبا وەک کاک عیسا مەسیحی، دوای ئەو خوالێخۆشبوو کاک حمید کریم مامۆکە، دوای ئەویش خوالێخۆشبوو کاک حاجی فەقێ رەسول، دوای ئەو خوالێخۆشبوو محسین اغا دوای ئەوانیش کاک فوئاد عەلی دوای ئەو ئەندازیار کاک سیروان فتحی جەلیزادە دوای ئەو کاک وشیار شەفیق، ئێستا ئەندازیار کاک کارزان بەرێوەبەرە کە بەکاک مشعان ناسراوە ئەمەش ناوی کارەباچییەکانی دائیرەی کارەبای کۆیە بوو:

١-خولێخۆشبوو کاک عبدالرحمن مام صالح مختار.
٢-خوالێخۆشبوو میرزای کارەبا.
٣-حسین وەستا برایم.
٤-خوالێخۆشبوو کاک نادر.
٥-کاک سلێمان کارەباچی.
٦- خوالێخۆشبوو اسماعیل کریم ناسراو بە اسماعیل یاهەیبەت.
٧-کاک مجید قادر.
٨-ملا محمد مەلاعبداللە.
٩-کاک کمال حمدامین.
١٠-کاک احمد کاکە زەرگار.
١١-کاک سلام سورە قەلایی.
١٢-کاک زاهیر سورە قەلایی.
١٣-صابر سورە قەلایی.
١٤-خوالێخۆشبوو کاک عثمان حەمە سۆیتەر.
١٥-خوالێخۆشبوو کاک علی حەمە بایزان.
١٦-خوالێخۆشبوو مام صدیق سماقولی.
١٧-خوالێخۆشبوو سعید عباس.
١٨-خوالێخۆشبوو کاک عثمان مالیان بەرامبەر نادی بوو
١٩-بورهان حەمەشین.
٢٠-برایم ئاغا.
٢١-خالید واحید ئاغا.
٢٢-عەولا مەلا.
٢٣-خوالێخۆشبوو رسول حەمە لاو.
٢٤-عبداللە رشید.
٢٥-شێرە رەسول حەمەلاو.
ئەمەی گرنگە هەندێک لەمانە لەپێناو روناکی شار گیانیان سپاردو شەهیدبوون.

ئەمـانەش مـال بـە مـال دەگەران سـەرە مانگـان سـەعاتیـان دەخوێندەوە پیاوی خۆشەویست و رووخۆش بوون:

١- خوالێخۆشـبوو کـاک فـتح اللـه کشـتەکان پیـاوەکی سەرسـپی بەتەمەن بوو لەسالانی شەستەکان.

٢- خوالێخۆشبوو کاک حوێز کریم باوکی کاک فوئاد.

٣- خوالێخۆشبوو کاک عثمان حەمە سۆیتەر.

٤- کاک فوئاد علی.

٥- کاک قادر فتح الله ژمێریار بوو.

٦- خوالێخۆشبوو کەمال تۆفیق یاسین ژمێریار.

ئەمانە کە باسمانکردن وەک ستافێک کاریان دەکرد بۆ خزمەتی شاری کۆیە ئەوەی جێگای شانازییە کارەباچییەکان هیچیان دەرچووی پەیمـانگە یـا دەسـتگایەکی زانسـتی نەبـوون بەزیرەکـی خۆیـان هەمـوو کـارێکی کارەباییـان ئەنجـام دەدا بەسـەر کەوتووانـە بێ ئـە وەی هـیچ کەرسـتە یە کـی خـۆ پاراسـتنیان هەبێ لە کـاتی کـار کـردن هەر بـۆیە سـالانە کارەبـاچی یەکـان دەبوونە شـە هیدی رێگـای روونـاکی سـلاو لە دلسۆزیان.



## زنجیرەی سی و هەشتەم

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران لەبەر خراپی ڕێگاوبان هاتووچۆ لەنێوان شارەکان زۆر زەحمەت بوو هاتووچۆ بەپاسی دارو سەیارەی لاندرۆڤەر ستێشن بوو ئەوەی سەیروسەمەرەبوو جاری واهەبوو بەیانی لەکۆیە بەرێدەکەوتین ئێوارە دەگەیشتینە هەولێر یا کەرکوک لەهاویندا هەموو دەم و چاوو جل و بەرگمان دەبوو بە تۆز کەدادەبەزین دەمێک خەریکی خۆداتەکاندن دەبووین جاری واهەبوو زۆر گەرم بوو ئارەقەمان دەکرد دەم و چاومان دەبوو بە قوراو تۆزو ئارەقە تێکەل بەیەکتر دەبوون.دەبوو زوو خۆمان بگەیاندبا مزگەوتێک یا شوێنێک ئاوی لێ بوایە.

لەزستانیش خراپتر سەیارە لە قور دەچەقی دەبوو هەموومان بەم سەرماو بارانە دابەزین پال بەسەیارەوە بنێین جاری واهەبوو سەیارە تەناشی دەکرد هەموو لاشەمان دەبووە قوراو باوەرتا هەبێ ئەوەندە سواری سەیارە نەدەبووین ئەوەندەی پالمان بەسەیارەوە دەنا لە دوای سەیارە دەرۆیشتین بەشی زۆری سەیارەکان زنجیریان لەتایە دەبەست.

گەراج لە کۆلانەکەی بەرامبەر منارەی مزگەوتی گەورەبوو نووسینگەی گەراجیش لەدوکانەکانی تەنیشت منارەی مزگەوت بوو ئەگەر سەفەرمان بکردبایە دەبوو رۆژێک یا دوو رۆژ پێشتر لەنووسینگە ناومان بنووسیبایە سەیارەکەم بوو رۆژانە دوو سەیارە بۆ هەولێر و دوو سەیارەش بۆ کەرکەک دەرۆیش، سەیارە١٢/نەفەری هەلدەگرت دوو لەپێشەوە چوار لە ناوەند شەش لە دواوە جانتاو کەل و پەلیشیان لەسەر چەمچەی سەیارە دادەنا زۆرجار لەرێگا نەفەر دەستی لێ رادەگرت لەسەر چاملغەکان سواری دەکردن دەستیان بەئاوێنەکانی ئەولاو ئەولای سەیارەکەوە دەگرت زۆرجار نەفەری زیاد ئەگەر لەرێگا پەیدابووایە لە چەمچەی سەر سەیارە سواری دەکردن باوەرتان هەبێ

هەبووە خۆی بەقادرمەی سەیارەکەوە خۆی هەلواسیوە تا شوێنی مەبەست.

نرخی گواستنەوەی نەفەر لە کۆیە بۆ هەولێر حەوت درهەم بوو بۆ کەرکوک هەشت درهە م بوو زۆر جار کە دەچوینە کەرکوک لەزستاندا لەرووباری شیوە سور دەماینەوە لەبەر لافاو هەلسانی ئاوی باران لە هەموو ئەمانەش سەیرتر کەدەگەیشتینە هەولێر یا کەرکوک دەبوو بەدوای یەکێک دابگەڕێین خەبەر بنێرینەوە بۆ دایک و باوکمان کە بەسەلامەتی گەیشتین جاری واهەبوو بە دوو سێ رۆژ ئەوجا خەبەرەکە دەگەیشت سەیارەکانی رێگای کۆیەو رانیە لاندرۆڤەری وەسەت و بەچادربوو رێگاکە زۆر خراپ بوو خوالێخۆشبوو مام احمد مامە عەدە ناسراو بە باب سەردار خەلکی بەرێ دەکرد بۆ رانیەو چوار قورنەو کانی ماران و داری قەمتەران و سەرخمە هەرکەس کە سواری سەیارەی رانیە دەبوو.

دەبوو پارچە حەبێکی رشانەوەی بکری بایە بی خواردبایە نەوەک برشا باوە گەراجی رانیە لەبەر دوکانەکەی ئێمەبوو کەنەفەر سوار دەبوون باب سەردار پێ ی دەگوتن حەبی ئیستیفراقتان پێیە ئەگەر نەفەرێک پێ ی نەبووایە دەیگوت وەرە خوار برۆ لەم دوکانە بکرە نەفەری رێگای رانیە زۆربەیان گوندنشین یا رەوەند یا توتنەوان بوون هەمیشە گونیەو کەل و پەلیان زۆر پێ بوو هەروەک باسمانکرد سەیارەی رێگای رانیە لاندرۆڤەری بە چادر بوو تەنها دوو نەفەر لەپێشەوە سوار دەبوو زۆرجار لەسەر پێشەوەو دواوە دەبووە شەر نرخی گوستنەوەی نەفەر پێنج درهەم بوو سائیقەکانی رێگای رانیە:

١-خوالێخۆشبوو شەهید مام عیزەت.

٢-خوالێخۆشبوو خورشید رەفعت عەلاو.

٣-خوالێ خۆشبوو مەلاحسام.

٤-خوالێخۆشبوو تایەر بەگ.

٥-خوالێخۆشبوو علی بەگ.

٦-خوالێخۆشبوو محمد لطیف اغا.

٧-خوالێخۆشبوو خالد وەستا حسن.

٨-کاک کاوە عمر چایەچی.

٩-خوالێخۆشبوو ابراهیم علی.

١٠-خوالێخۆشبوو حاجی حاجی تایە ر داروغا.

١١-خوالێخۆشبوو کاک حوێز باوکی مۆفەق.

١٢-خوالێخۆشبوو عثمان حەمە لاو.

١٣-خوالێخۆشبوو مۆفەق حوێز.

١٤-کاک مەلای مەلا قادر.

١٥-خوالێخۆشبوو برایم مام بایز.

١٦-خوالێخۆشبوو حمدامین بایز.

١٧-کاک عبداللە باب سەردار، ناسراو بە عەولارەش.

١٨-خوالێخۆشبوو حویز اسماعیل.

جگە لەمانە بەرپرسی خەتی رانیە کۆیە باب سەردار بوو دوای ئەو خوالێخۆشبوو مەهدی لطیف اغا بەڵام بەرپرسی خەتی هەولێر کۆیە کەرکوک کۆیە خوالێخۆشبوو کاک رەفیق خەلەف بوو دەگێرنەوە دەڵێن یەکەم کەس کەسیارەی هێناوەتە کۆیە حاجی لچۆبووە دوو سەیارەی نوێی بۆ بکر و عمری کوری کریوە دوای ئەو مام حمید برای حاجی ملا اومر دوای ئەوان چەند کەسێک سایق بوونە لە کۆیە لەخەتی هەولێر کەرکوک کاریان کردووە.

١-خوالێخۆشبوو مستەفا مەروان پاسی هەبوو.

٢-خوالێخۆشبوو گەرەبێت پاسی هەبوو کەئەرمەنی بوو.

٣-خوالێخۆشبوو شێخیل.

٤-خوالێخۆشبوو خدرە شەل.

٦-خوالێخۆشبوو عزیز جانەوەر.

٧-خوالێخۆشبوو فاتح احمد.

٨-خوالێخۆشبوو دلشاد حاجی کریم.

٩-خوالێخۆشبوو سلیمان نجار.
١٠-خوالێخۆش بوو قادر نجار.
١١خوالێخۆشبوو فوئاد وەستا عمر.
١٢-خوالێخۆشبوو خالد مام عبدالرحمن.
١٣-خوالێخۆشبوو قادر شریف.
١٤-خوا لێخۆشبوو مغدید حاجی.
١٥-کاک محمد بابۆ.
١٦-خوالێخۆشبوو اکرم مەنسور.
١٧-خوالێخۆشبوو عمر مەنسور.
١٨-خوالێخۆشبوو حاجی فقێ عەولا.
١٩-کاک خالد زاوای محمد عبدالله جەیدی.
٢٠-کاک سعید حەمە دەروێش.
٢١-خوالێخۆشبوو کاک تایەر.
٢٢-خوالێخۆشبوو نوری تەق تەقی.
٢٣-خوالێخۆشبوو سعید تەق تەقی.
٢٤-خوالێخۆشبوو عبدالله مەلاصابر.
٢٥-خوالێخۆشبوو قادر عمر حاجی لچۆ.
٢٦-کمال عمر حاجی لچۆ.
٢٧-کاک علی عمر حاجی لچۆ.
٢٨-خوالێخۆشبوو زاهیر حەمکول.
٢٩-خوالێخۆشبوو سمکۆ مام قادر.
٣٠-کاک فاضل محمد عمر.
٣١-خوالێخۆشبوو انور خورشید بەگ.
٣٢-سلام حمدامین بەگ.
٣٣-خوالێخۆشبوو محسن بەگ.
٣٤-کاک دلاوەر مجید جەلیزادە.
٣٥-خوالێخۆشبوو اسماعیل حاجی فتح الله.

٣٦-خوالێخۆشبوو كريم كەوباز.
٣٧-كاك احسان مام كمال.
٣٨-خوالێخۆشبوو كاك مامە احمد خدر گرتک.
٣٩-خوالێخۆشبوو فەقێ سليم.
٤-كاك ابراهيم يافاتم.
٤١-كاك حمدامين.
٤٢-خوالێخۆشبوو على احمد ناسراو بەخەتەر.
٤٣-خوا لێخۆشبوو مولود احمد مام قلينجى.
٤٤-خوالێخۆشبوو رەئوف اسماعيل زريان.
٤٥-كاك حوێز حاجى تايەر.
٤٦-خوالێخۆشبوو فاضل مام زرار.
٤٧-نەجات يافاتم.
٤٨-خوالێخۆشبوو شفيق خلف.
٤٩-كاك عمر حسن.
٥٠-خوالێخۆشبوو مام قادر مام تايەر.
٥١ -كاك ئاراز مام تايەر
٥٢-كاك مطلب مستەفا.
٥٣-كاك ئاشتى عزيز.
٥٤-كاك اسماعيل عزيز.
٥٥-خوالێخۆشبوو حلمى يەشەل.
٥٦-خوالێخۆشبوو صديق شەل.
٥٧-خوالێخۆشبوو كريم خدر.
٥٨-خوالێخۆشبوو وشيار خدر.
٥٩-كاك اسماعيل مامەامين.
٦٠-خوالێخۆشبوو كاك واحد ابوبكر قصاب.
٦١-كاك حميد كمال.
٦٢-كاك عمر قەرەنى.

٦٣-خوالێخۆشبوو کاک فتاح مولود.
٦٤-کاک رزگار فتاح مولود.
٦٥-غازی فتاح مولود.
٦٦-خوالێخۆشبوو رسول بایەزید.
٦٧-کاک فریاد رسول بایەزید.
٦٨-خوالێخۆشبوو خارە حسین.
٦٨-خوالێخۆشبوو شە هید سامی ملا محمد.
٦٩-خوالێخۆشبوو حمید تاهر حەبۆر.
٧٠-جمال حاجی رسول قۆرچی.
٧١-خوالێخۆشبوو محمد علی گچکەل.
٧٢-خوالێخۆشبوو احمد علیَ گچکەل.

لەدوای حەفتا گەراج چووە بەرامبەر باغی فریشتە لە دوای سالی دوو هەزار گەراج چووە نزیک هەرمۆتە، جاران کەل و پەل لە بەغدا دەگوازراوە بەهۆی نەقلیات شمال بریکارەکەی خوالێخۆشبوو کاک امین حەمە گران بوو، جاران لەگەل ئەوەی رێگای هاتووچۆ خراپ بوو بەلاّم رووداوی هاتووچۆ کەم بوو لەکۆیە چەند کەسێک سەیارەی تایبەتی خۆی هەبوو وەک:

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا جلال حوێز.
٢- خوالێخۆشبوو عزیر مغدید.
٣- خوالێخۆشبوو کمال حاجی مجید.
٤- خوالێخۆشبوو کاک باقی حاجی جلال.
٥- خوالێخۆشبوومەلا حەوێز ئاغا.
٦- خوالێخۆشبوو کاکە سور تالەبانی.
٧- خوالێخۆشبوو کاک عوسمانی عەونی.

جاران یەک بەنزینخانەی بچووک هەبوو لە کۆیە کەلە خانووەکی بچووک بوو لەبەرامبەر گردی قشلە جاران بەنزین و نەوت بە تەنەکە دە فرۆشرا لە کۆیە. لە کۆیە دووفیتەر هەبوون:

١- خوالێخۆشبوو عزیز جا نەوەر.
٢- خالد مام مجید.
چەندعەمبارێک هەبوو کەتایبەت بوون بە گەراج:
١- خوالێخۆشبوو عبدالرحمن خەمانە.
٢- مام برایم تائێستا لەژیان ماوە.
٣- مام رەشاد شەریف.





# زنجیرەی سی و نۆیەمین

(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

شاری کۆیە هەمیشە لەگەل پێشکەوتنەکانی سەردەم هەنگاوی ناوە هەر بۆیە لەرێگای فۆتۆو شیعری شاعیرەکان توانراوە جوانی سروشتی هەر چوار وەرزی سال بە جیهان ئاشنا بکات لەلایەک حاجی بەهۆنراوە وەسفی جوانی کۆیە دەکات وەک ئەوەی کامیرەیەکی مۆدێرنی بەدەستەوە بێ کە دەلێ:

لە مابەینی کەکۆن و هەیبەت سولتان
شنەی ئێواران سایەی سبەینان
یا کە عاصی دەلێ:
من کە کۆیەم سەیری باغ و مە نزەرەم
گەربێتو لوبنان من ببێنێ بێشک دەگرێ وەرەم

راستە درەنگ ئەم پیشەیە لەلایەن کۆیەکان پەیرەو کراوە بەلام هەر وەک باسمانکرد شاعیرەکانمان بە هۆنراوەکانیان تارادەیەک توانیویانە شوێنی وێنەگرەکان بگرنەوە ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین ئەم وێنەگرانە پیشەی وێنە گرتنیان لەشاری کۆیە ئەنجام داوە

١- خوالێخۆشبوو کاک محمد شوان یەکەم کەس بووە لە شاری کۆیە ستۆدیۆی داناوە لەمانگی شوباتی/١٩٥٢ز، کاک علی حمدامین شەریکی بووە ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین لەسالی (١٩٦٤) کاک محمد عبدالکریم شوان دادەمەزرێ لەمالیەی کۆیە لەناو سەرا، دوای ئەو کاک علی حمدامین بەردەوامی بەستۆدیۆکە دەدا ناوی ستۆدیۆکە لە ناوی شوان دەکاتە ستۆدیۆی چنارۆک.

٢- علی حمدامین خاوەنی ستۆدیۆ چنارۆک چەند سالێکە هاتۆتە هەولێر بەلام لەبەر ئەوەی بێ تاقەت بووە ئێستا ئەم کارە ناکات.

٣- کاک بەکر مەنسور خاوەنی ستۆدیۆی سپۆرت.

٤- خوالێخۆشبوو کاک توفیق مەلا کەریم خاوەنی ستۆدیۆی باواجی.

٥- کاک جەبار مەلا کەریم.

٦- کاک محمد مەهدی لەساڵی ١٩٧٥ز ستۆدیۆی دانا بەناوی ستۆدیۆ نەورۆز.
٧- خوالێخۆشبوو کاک عزیز حمد لە ساڵی ١٩٧٦ستۆدیۆی دانا
٨- خوالێخۆشبوو کاک غەفور حاجی یەحیا.
٩- کاک شێرکۆ غەفور حاجی یەحیا لەگەل کاک رۆستەم سەلام ستۆدیۆیان دانا وێنەی شەمسیشیان دەگرت بەناوی وێنەگری کۆیە.
١٠- کاک جمال مستەفا ستۆدیۆی رێبینی دانا.
١١- کاک بەختیار مستەفا.
١٢- ئازاد مەهدی و بێستون سەلام ستۆدیۆی ئازادیان دانا.
١٣- کاک امیر سید جلال ستۆدیۆی دیجیتالی دامەزراند.
١٤- کاک دەریا زرار ستۆدیۆ دەریای دامەزراند.
١٥- ستۆدیۆی توانا سالح نەجم کە کاک توانا خاوەنەکەی بوو بەهەمان ناویش دانرا.

جگە لەمانە لەکۆیە تاقیگەیەکی وێنەی لێ یە بەناوی تاقیگەی سۆنیا خاوەنەکەی کاک ساهی سەفین و کاک نەهرۆ تۆفیق بەم دواییە چەند ستۆدیۆیەکی دیکە کراوەتەوە وەک ستۆدیۆ بەرزنجی، هەروەها ستۆدیۆ رشاد سوری هە ندێک وێنەگری شەمسی هەبوون لەساڵەکانی شەست بەدواوە وەک:

١- خوالێخۆشبوو ابراهیم فقێ حسن.
٢- خوالێخۆشبوو کاک مهدی محمد.
٣- خوالێخۆشبوو کاک مستەفا حمد ناسراو بە کاک مستەفای نەجار.
٤- خوالێخۆشبوو مامەند سۆفی تەها کە بۆ بۆماوەیەکی کەم ئەم کارەی کرد.

بەراستی سەیربوو کە دەچووین بۆ رەسم گرتنی شەمسی لەسەر کورسی یەکیان دادەنایین وێنەگرەکە دەهاتە لامان بەهەردوو دەست سەری دەگرتین دەی سوڕاند گوایە بۆ ئەوەی رووی لەعەدەسەکە بکات دوای وێنەگر دوور دەکەوتەوە دەستی دەخستە ناو پەرۆیەکی رەش رووی لەمە دەکرد دەیگوت هەناسەت راگرە جاری واهەبوو

نەختێک درەنگ رەسمەکەی دەگرت تەنگە نەفەس دەبووین هەتا رەسمیان دەگرتین بۆ خۆشیتان جارێک لە دائیرەی تەربیە داوای رەسمیان کردبوو لە خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ کەرخی چووبوو دوو رەسمی شەمسی گرتبوو رەسمەکانی لەرێگای قوتابخانە رەوانەکران بۆ پەروەردەی هەولێر دوای حەفتەیەک رەسمەکانیان ناردەوە بۆ قوتابخانە بە نووسراوێکی فەرمی نووسی بوویان ئێمە رەسمی تۆمان داوا کردووە نەک عەکس.

مامۆستا دەم و چاوی و پرچی وەک بەفر بوو بۆیە وێنەکە سپی سپی دەرچوو بوو جگە لەمانەی کە باسمانکردن ستۆدیۆی نەورۆز بووە بە جوانترین ئەرشیف بۆ شارەکەی حاجی ئەم کامیرانەی کە بەکاریان دەهێنا بۆ چرکاندنی وێنە لە جۆری یاشیتا۱۲/۳٦فلیمی بوو. کاتی خۆی ئینگلیز و تورکەکان هاتوونەتە کۆیە وێنەی شوێنەوارو پیاو ماقولانی شاریان گرتووە وەک حەمە اغا، مەلا محمد جە لیزادە، جمیل اغای حەوێزی خوالێیان خۆش بێ بەشی زۆری وێنەگرە شەمسییەکان نەماون لەگەل ئامێرو کەل و پەلەکانیان ئەم کامیرەیەم لە سالّی ۱۹٦٥ کریوە تائێستا کاردەکات ئەگەر فلیمی ۱۲/۳٦ هەبێ.

دەشلێن هەفتەی جارێک لەساڵەکانی پەنجاکان گوی موکریانی جارێک دەهات لە هەولێر وێنەی خەلکی کۆیەی دەکێشاو دەگەڕایەوە.





## زنجیرەی چل

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جـاران لە شـاری کـۆیە کەسـانێک هەبـوونە لەهەردوو رەگەز دەنگێکی خۆشیان هەبووە لەکۆرو کۆبوونەوە کۆمەلایەتی و ئاینییەکانی وەک خوێنـدنەوەی مەولـود و کەبـارکردن لە بلنـد گـۆی مزگەوتەکـان بەشداریان کردووە خەلکی کۆیە چێژیـان لـێ وەرگرتـوون هەر بۆیە کە گـوێ بیسـتی گـۆرانی بێژێـک دەبـن یەکسـەر نـاوی دەنـگ خۆشـەکانی جارانی کۆیە دەهێندرێت هۆکاری سـەرەکی هەبوونی دەنگ خۆش لەم شارە بۆ جوانی سروشت و هەوای سازگاری دەگەرێتەوە.

١-مەلا ئەسـعەدی مەلا تەهـای قـادری سـابلاخی، خوالێخۆشـبوو خارە جەلال بۆی گێرامەوە کە مەلا سەعیدی برای لەسەر دەشت ژنێکی بەنـاوی ئامینـە بـۆ دەخـوازێ دوای کـۆچکردنی ئامینـە مەلا ئەسـعەد دەگەرێتەوە کۆیە ژیانی هاوسەری پێک دێنێت لەگەل کچە کەرکوکییەک کە باوکی ئۆنباشـی بـووە بەنـاوی ئامینـە کەچاوێکی نەبوو هاوشـێوەی مەلا لەئەسعەد هەردوو هاوسـەرەکانی منداڵیان نەبووە.

خارە جەلال گوتی وەسیەتی لای من کرد کە لەگردی کەکۆن بە خـاک بسـپێردرێ لەبەهـاری سـالی ١٩٥٨کـۆچی کـرد لەتەنیشـت سـەید جامی بەخاکمـان سپارد، مـالی مەلا ئەسـعەد بەرامبەر دیواری تەکیەی تاڵەبانی بوو هەمیشە چاوی راستەی بە پەرۆیەک دەبەستەوە بەیانیـان بەدەم کەبـارکردن لە بلند گـۆی مزگەوتـی گەورە خەلکی شـاری لەخەو رادەپەراند، مەلا ئەسعەد مەقام بێژەکی بێ هاوتابوو کـاریگەری تەواوی هەبوو لەپاراستنی مەقامی کوردی.

٢-خوالێخۆشـبوو کـاک حمـدامین عەبـاس چایخـانەی لەتەنیشـت کۆلانی پارکی شەهیدانی قورەبەرازە بوو دەنگێکی بەسـۆزی هەبـوو بـۆ غەزەل بەشداری مەولود خوێندنەوەی دەکرد.

٣-خوالێخۆشبوو مام قادر باوکی مامۆستا حمید فەرمانبەر بوو لەسەرای کۆیە دەنگێکی بەسۆزی هەبوو لە بۆنەکانی ژن گواستنەوە گۆرانی دەگوت.

٤-خوالێخۆشبوو کاک احمد حەمە مەلا.

٥-خوالێخۆشبوو شەفیق مام خەلەف.

٦-خوالێخۆشبوو مچە حەوێز بەرە چەلەک سلێمانی بووە.

٧-خوالێیخۆشبوو خارە سێوەی هەرمۆتە دەنگ خۆش بووە بەشداری ئاهەنگەکانی کۆیەی کردووە، باوکم رەحمەتی لێبێت دەیگوت لەسالی ١٩٣٧ لەگەرەکی بایزاغا خانووم دروست دەکرد رۆژانە سێوەم بانگ دەکرد مەقام و گۆرانی بۆکرێکارەکان دەگوت لەجیاتی رادیۆ بۆ ئەوەی کرێکارەکان دلخۆش بکات لە سالی١٩٦٣ کۆچی دوایی کردووە لەهەرمۆتە نێژراوە.

٨-خوالێخۆشبوو باقی مام صالح دە نگ و سەدای خۆشبوو پیشەی سەرتاش بوو لە دوکانەکانی بن هوتێلی حاجی رەفیق بوو .

٩-کاک ابراهیم سابیر باخچەوان.

١٠-خوالێخۆشبوو کاک عبداللە سمایل چاو شین گۆرانی بێژوو پیشە وە رێکی باش بوو لە لباد.

جگە لەمانەی کە باسمان کردن هەندێک دەنگ خۆشی دیکە هەبوون کەمەولودیان دەخوێندەوە وە هەندێک جاریش غەزەلیان دەگوت وەک:

١-مەلا محمد ملا شفیع.

٢-مەلا ئەحمەدە کۆرە کە بەئەسل سماقەیی بوو تەنها دوو کچی هەبوو بەناوەکانی(فاتم و بەهیە) ناوی سیانی مەلا ئەحمەد حەسەن نبی مەولود خوێنەکی زۆر شارەزاو دەنگ خۆش بووە.

٣-مەلا ئەسعەد دەنگ و سەدایەکی خۆشتر لە دەنگی قاسپە قاسپی کەو.

٤-خوالێخۆشبوو مەلا حکیم ملا عبد الرحمن.

جگە لەمانە چە ند ژنێک هەبوون شارەزاییان لەمەولود خوێندنەوە هەبوو.

١-خوالێخۆشبوو فەقێ پیرۆز خێزانی خوالێخۆشبوو وەستا محی الدین دایکی مامۆستا عزالدین.

٢-خوالێخۆشبوو فەقێ رابیعە حافز بوو کچ بوو ژن خوشکی خوالێخۆشبوو حاجی واحدبوو دەکاتە پوری خوالێخۆشبوو حاجی سائق.

٣-خوالێخۆشبوو خاتوو فەزیلە سمایل ئاغا مەولود خوێنێکی لێهاتوو بوو.

لە کۆیە چەند ژنێکی دیکە هەبوون شارەزاییان لەقورئان و لێکدانەوەی هەبوو زۆر بەباشی لەوانە.

١-فەقێ رەعنا فەقێ صالحی ئاورەحمان بەگ شارەزایەکی باشی لە قورئان هەبوو، کە دەکاتە دایکی جەلال جۆبار و تۆفیق حاجی تاهیر داروغا.

٢-فەقێ تفاحە مامۆستای فەقێ رەعنا بووە.

لەخارە تۆفیقم بیستووە چەند ژنێکی دیکەش هەبوون شارەزایان لە قورئان هەبووە وەک(فەقێ فاتم، فەقێ گوری، فەقێ حەلیم).خوالێخۆشبوو خارە جەلال جۆبار بۆی گێرامەوە کاتی خۆی گوتی لە کۆیە پیاوێک هەبوو ناوی مچە حەبێ کشمش بوو ناسرابوو بە مچە ژنانی ئەم کابرایە خەلکی لای سلێمانی بوو بێ کەس بوو پیاوێکی بالا بەرزی باریکی سمێل گەورەبوو لەپێش بوک سەماو سوری دەداو دەسرۆکەی ئالو والای با دەدا، لە کۆیە مچەژنانی بەم پیاوانە دەلێن کە گوێ رایەلی ژنەکانیانن کاری ناومال دەکەن جاران خەلکی لەلای مەلاو سوختە خانەکان فێرە خوێندن و خوێندەواری دەبوون یەکێک لە سوختەخانەکانی کۆیە سوختەخانەی مەلا کەمال بوو. کۆیەکان زۆر شەیدای خوێندن بووینە بۆیە لەسەر داواو بەدواچوونی خەلکی شاری کۆیە لە سالانی١٩٢٤/١٩٢٣ قوتابخانەی کوران لەم شارە

کرایەوە لەسەر دەستی خوالیخۆشبوو سالح زەکی بەگ ساحبقران، لەگەل کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە خوا لێخۆشبوو مەلا محمد جە لیزادە یەکەم کەس بووە کچەکەی کە ناوی نجیبەخان بووە خستویەتیە بەرخوێندن لەقوتابخانەی کوران کە شتێکی زۆرسەیر بووە لای هەندێک لەکۆنە پەرستەکان کۆیە شاری شاران بووە هەمیشە رێچکە شکێن بووە بۆ بەرەو پێش چوون لە ساڵی١٩٣٢بەفەرمی بۆ یەکەمجار قوتابخانەی کچان کرایەوە لەسەر دەستی هەمان قایمقام لە کۆیە دوکاندارەکان زۆر هەولیان دا کە قوتابخانەی شەوانەیان بۆ بکرێتەوە لەساڵی ١٩٢٧بەلام بەفەرمی قوتابخانەی شەوانە کرایەوە لەساڵی ١٩٣٤بەلام خێرخوازو چەند دلسۆزێکی شار وانەیان دەگوتەوە بەخۆبەخش تا ساڵی ١٩٣٦ بودجەیان بۆ تەرخان کرا بۆ مامۆستایانی وانەبێژ بۆیە ئەمرۆ دەبینین کەکۆیە جیا لەشارەکانی دیکە رێژەی خوێندەواری و پلەو پۆستی گەورەیان هەیە کەتوانیویانە شوێنی خۆیان لە دام و دەستگاکان بکەنەوە هەر بۆیە هە قمە شانازی بکەم بەشارەکەم و سەربلندم پێی.


نەجیبە خان مەلای گەورە


مەلا کۆرە (احمد حسن حمد نبی)


عبدالرحمن اسعد
(مەلا عبدالرحمن بانگدەر )

## زنجیرەی چل و یەکەمین

**(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)**

شاری شاران جاران هەموو پیشەوەرێکی لێبوو کە کاروبارو پێویستییەکانی شاریان جێ بە جێ دەکرد جاران وەک دایکم خوالێ ی خۆشبێت بۆی گێرامەوە دەیگوت ئاو لەحەمامۆکەوە بەجۆگە دەهاتە خوار چەند ئاشێکی ئاو هەبووە لەسەر ئەم ئاوە بە ئاو کاریان کردووە لەسالانی ناوەراستی چلەکان بەبۆری ئاو راکێشرا لەسەرچاوەی حەمامۆک بۆ ناو شارو ماڵەکانی هەرچوار گەرەکی کۆیە کە تاسالی (١٩٥٨) ئەم چوار گەرەکەبوون:

١-بایز اغا کە لەگەرەکە پێشکەوتووەکان بوو وەک گەرەکی دۆلاراوە بووە.

٢-گەرەکی هەواوان بەشی زۆریان خاوەن رەزو باخ بوون زۆر خولیاو حەزیان لەراو بوو خۆشەویست بوون.

٣-گەرەکی بەفری قەندی دەکەوێتە پشت دادگای کۆنی کۆیە ئەم گەرەکە لەبەر ئەوەی شوێنەکەی نزم بوو زستانان لەکاتی باران بارین بەسە ر ئاو دەکەوت خزمەکانمان لەم گەرەکەبوون.

٤-گەرەکی قەلات لە مزگەوتی محموداغا تا دەگاتە حەوزی بەلوعە

دوو وەستای زۆر شارەزاو کارامـا توانیان بە بۆری ئاو لە حەمامۆک راکێشن بۆ حەوزی بەلوعە لەوێشەوە ئاو دابەش دەکرا بەسەر مالانی هەر چوار گەرەک ئەم دوو وەستایە.

١-خوالێخۆشبوو کاک محمد عبدالله جەیدی کە چەند سالێک پێش ئێستا کۆچی کرد هەتا دواساتەکانی ژیانی کاری بۆریە چی و کلیل سازی دەکرد وەستایەکی بەناوبانگ بوو.

٢-خوالێخۆشبوو کاک عبدالزاق عمر بۆتانی ناسراو بوو بە کاک عبدالرزاق بەلوعە ناوبراو هەمیشە کلیلی ئاوبەردانەوەی لەسەرشان بوو وەک میراو بوو ئاوی بۆ مالان بەردەداوە هەموو جار کە دەهاتە گەرەک خەلکی گەرەک پێیان دەگوت پشکێکی تر قوفلەکە بکەوە با ئاو

باشتر بێتە ناوماڵان، بەراستی پیاوێکی خۆشەویست بوو پیاوێکی بەشێوە خرکەلەی رەش ئەسمەربوو چەند کەسێکی دیکەش هەبوون ئاو بەردەرەوە بوون.

٣-خوالێخۆشبوو کاک اسماعیل حمد بەگ قادر چاو شین ناسراو بوو بە کاکە افندی ئاو بەردەرەوە پیاوێکی بەژن کورتی قسە خۆش و گاڵتەچی بوو.

٤-خوا لێخۆشبوو کاک جلال فەقێ رسول پیاوێکی بێ دەنگ و خۆشەویست.

٥-خوالێخۆشبوو کاک رەفیق اسماعیل.

٦-خوالێخۆشبوو کەریم ئاغا.

٧-خوالێخۆشبوو سلێمان مام کەریم کە ناسراوبوو بە سلێمان ئاو بەردەرەوە.

٨-کاک شەنگە پیاوێکی خۆشەویست بوو لە ساڵەکانی کۆتایی پەنجاکان لەبیرمە لەناوچەی سێ سونیایەتی ئێران کەنزیک شاری سەردەشت بوو بە ماڵەوە هاتنە کۆیە لەنزیک ماڵی ئێمە لە ماڵی یاحەیات نیشتەجێ بوون دوایی دەستی بەکاری بۆریە چی کرد وەستا شەنگە برایەکی لەراپەڕین شەهیدبوو بە ناوی مام ابراهیم.

٩-خوالێخۆشبوو مغدید خدر کە ناسرابوو بە کاک مەغدید بەلۆعە وەستایەکی کارامەو قسە خۆش بوو کورەکانیش بە ناوی سەرباز و سەرکەوت و سەرهەد هەمان کاریان دەکرد لەگەل باوکیان.

١٠-وەستا مستەفا ئاو بەر دەرەوە.

سەرجەمیان لە ژیان نەماون ئێستا ستافێکی نوێ لەشاری کۆیە کاری ئاوبەردانەوە دەکەن.

جاران هەروەکو باسمانکرد ئاوی حەمامۆک گەلێک زۆربوو خوالێخۆشبووان دایکم و مامە احمد کەئاش وەستای هەموو ئاشەکانی کۆیە و تۆبزاواو هەرمۆتەو شیلەو گوندی جەلی بوو، گوندی جەلی دوو ئاشی لێ بوو ئاشی ماڵی حاجی حمدامین فقێ محمد و ئاشی

حەمە دەروێش لەسەر رووباری جەلی بوون هەتا حەفتاکان کاریان دەکرد، جگە لەمانە دەچووە رانیە مامە صالح لە رانیە ئاشی هەبوو لە گەرەکی قەلات مام احمد کارگەیەکی دروستکردنی بەردە ئاشی هەبوو لە نزیک گوندی فەقێیان ئەمەی گرنگە کاری بە کەرستەی زۆر سەرەتایی دەکرد وەک(نوێر، باریە، چەکوچی گەورەو بچوک، سمبە، باروت وکە بسول)بێ ئەوەی وەک ئێستا کەرەستەی پێشکەوتووی لەبەردەست بێ، کۆیی یەکان بەهێزو بازووی خۆیان شەریان لەگەل سروشت دەکرد بۆ دروستکردنی پێداویستییەکانی سەردەم و بژێوی ژیان جاران لەسەر جۆگەی ئاوی حەمامۆک نزیکەی حەڤدە ئاشی ئاوی لەسەر بووە وەک مامە احمد بۆی گێراوەمەوە کە ئاش وەستابوو.

ئەوەی جێگای داخە هەندێک بەرپرسی ئەم شارە چەند بیرێکیان لەتەنیشت سەرچاوەی حەمامۆک هەلکەندوە خەریکە ئاوەکەی حەمامۆک بەرەونەمان دەچێت سەردەمانێک پێداویستی شارێکی دابین دەکرد بە ئاو بۆ زانیاریتان بەشێک لەگەرەکی بایزاغا بە سێ ناو ناو دەبرا گەرەکی مۆسکۆ زۆربەی دانیشتوانەکەی شوعی بوون جگە لەمە پێیان دەگوت گەرەکی ئاشان چونکە چوار ئاشی لێبوو ناوێکی دیکەشیان پێ دەگوت بازارە گچکەلە. بەراستی کۆیەی جاران شاربووە بەڵام مەخابن بۆ بەرپرسەکانی ئەمرۆ کەشاریان بەم وێرانیە گەیاند.



عبدالرزاق بەلۆعە



حەمەی عبداللە جەبدی



مەغدید خدر بەلۆعە

## زنجیرەی چل و دووەمین

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

هەروەک باسمانکرد جاران هەموو مالێک پێویستی بەئاش و ئاشەوان هەبوو هیچ مالێک نەبوو گەنمی سالێک عەمبار نەکا جاران گەنم بەتەنەکە و کۆل دەپیورا مالی واهەبوو دوو کیلە گەنم یا عەربەیەک یا زیاتری دەکری بۆ ئاردی سالانە کەگەنمی سالانەی دەکری هیچ خەمی نەدەما دەیگوت نانەکەم هەیە زۆر بەقەناعەت بوون نەوەی نوێ نازانێ کیلە و عەربە چەندە یەک کیلە چوارتەنەکەی پرە، عەربەیەک چوارکیلەیە واتە ١٦/تەنەکە.

جاران مالە دەولەمەندەکانی کۆیە لەناو دیوار عەمباری گەنم هەلگرتنی هەبوو لەسەرەوە بەتەنەکە گەنمان تێدەکرد لەبنەوەش کونێک هەبوو بەپێ ی پێویست گەنمی لێدەهاتە دەرەوە خانووی قەدیمی ئێمە لەگەرەکی بایزاغایە عەمبارێکی گەنمی لەناو دیوار تێدایە٦٤ /تەنەکە گەنمی دەگرت ئێستا بووە بە مالی خوالێخۆشبوو حاجی رەزای توتن فرۆش هەش بوو لەکەندووی بەرمیلی دەکرد جاران وەک ئێستا نەبوو ئارد بەفەردە بێتەوە بەردەستی کابان دەبوو کابان گەنمی باراشی پاک بکردبایەوە لە گونیەی بکردبایە تا ئاشەوان دەیبردبۆ ئاش و دەیکرد بەئارد.

کاتێ ئاشەوان ئاردەکەی دەهێناوە دەبوو ئەم ئاردە روو بکەن لەسەر پەرۆیەک تاسارد بێتەوە ئاشەوان لەبەرامبەر هەرتەنەکە گەنمێک درهەمێکی وەردەگرت هەر مالە ئاشەوانێکی تایبەت بەخۆی هەبوو دووجۆر گەنم بەکاردەهات بۆ ئاردی نان قەندەهاری رەشگول جگە لەعەمبارکردنی گەنمی نان سالانە هەموو خێزانێک کیلەیەک گەنمی ساواری دەکری لەگەل تەنەکە نیسکێک و تەنەکە ماش و نۆک، نیسکی جاران ئاوەکەی رەشبوو وەک ئێستا زەرد نەبوو هەموو مالێک کە گەنمی ساواری دەکری کاپان پاکی دەکردەوەو لەمەنجەلی گەورەی رەش بەدار دەیان کولاند لەکۆلان دوای چەند سەعات لەکولاندن ژنی

جیران هەرەوەزیان دەکرد بەتریانان دانولەیان دەبردە سەربان لەسەر پەرۆکەی کۆنە هەریان دەخست هەفتەیەک لەبەر هەتاو دەمایەوە تا وشک دەبووە ماوەی ئەم هەفتەیە دەبوو ئێمەی مندال لەسەربان ببین بە پاسەوانی ئەم دانولەیە نەوەک چۆلەکە بیخوات دوای وشک بوونەوە لەلایەن پیشەوەری ساوار کوتەوە دەکوتراوە.

باشترین ساوار کوتەرەوە خوالێخۆشبوو خارە مجید مام کەریمی دەباغچی بوو پێیان دەگوت مجید قەلەو پیاوێکی جوانی بالا بەرزی چوار شانەبوو کوتکێکی داری گەورەی سەربزمار ریژکراوی لەسەرشان دادەنا بەکۆلانان دادەهات دەیگوت ساوار دەکوتینەوە هەر مالێک ساواریان هەبووایە بانگیان دەکرد ساواریان بۆ ئامادە دەکرد لەدەوروبەری جۆنی بەردێکی پان یاتەختەیەکیان بۆ خارە مجید دادەنا بۆ ئەوەی لەسەری دابنیشێت، کابان هێدی هێدی بە جامێک ساواری لەجۆنی دەکرد خارە مجیدیش بە کوتکە گەورەکەی دەیکوتاوە چەندجار کوتکی بلند دەکرد خارە مجید دەیگوت هەی اللە هەی اللە باوەرتان هەبێ خەلکی لەم سەری گەرەک گوێیان لە دەنگی کوتک و هەی اللە مام مجید دەبوو ئەم پیاوە قورکێش و سواغی سەربانی مالانی دەکرد شۆفەری زەمانەبوو، زۆرجار بەشەو ساواری دەکوتاوە لەبەر چراو قەندیلەو لۆکس لەدوایی کابان جارێکی دیکە ساوارەکەی هەردەخست و بەئاشە وان دەینارەدەوە ئاش.پیاوێکی تریش هەبوو بەناوی مام حەوێز باوکی مامۆستا علی ساواری دەکوتاوە جاران کابان ئاردە ساواری کۆدەکردەوەو دەیکرد بە ئەستوک جاری وا هەبوو تزیلکی لەسەر دادەنرا بەراستی کابانی جاران ماندووبوون خواردنیش هەمووی تەندروست بوو بۆیە نەخۆشی قۆلۆن و گەدەو..هتد کەم بوون هیچ مالێک نەبوو کە پێویستی بەئاش و ئاشەوان نەبێت جگە لەمە بەشی زۆری ئاشەکانی شارو گوندەکان ئاشی ئاوبوون بە ئاو کاریان دەکرد باشترین ئاش وەستای جاران لە کۆیە بوو کە مامم بوو وەستا احمد حمد مستەفای دەباغچی بووە لەسالی

١٩١٠ز. له كۆیه له‌دایک بووه له ١٩٧٧/٧/٤ كۆچی دوایی كردووه له كۆیه له‌گۆرستانی ده‌روێش خدر به‌خاک سپێردراوه هه‌ركاتێک مامه احمد نه‌خۆش بووایه كاریگه‌ری له‌سه‌ر تاک به‌تاكی هه‌موو مالێک هه‌بوو چونكه ئاشه‌كان بێ ئه‌و هیچیان پێ نه‌ده‌كرا جگه له‌ئاش وه‌ستایی ئاشیشی داده‌مه‌زراند كانگای به‌رده‌ئاشی هه‌بوو مامم بۆی گێرامه‌وه گوتی جاران ته‌نها له‌م شاره نزیكه‌ی ١٧/ ئاش هه‌بوون كه به‌ئاوی سه‌رچاوه‌ی حه‌مامۆک كاریان ده‌كرد وه‌ک:

١-ئاشی مام عه‌بده مام صالح.

٢-ئاشی ئه‌وقاف.

٣-ئاشی ئاغه‌لێ.

٤-ئاشی حاجی مه‌لای حه‌مه شه‌ل.

٥-ئاشی سابیری احمد لیله.

٦-ئاشی ساغه.

٧-ئاشی سێ توان.

٧-ئاشی مام خدر به‌رامبه‌ر قه‌سرێ.

٨-ئاشی محمود اغا.

٩-ئاشی گه‌ره‌كی ئاشان.

١٠-ئاشی وه‌ستا عه‌بده‌ی وه‌ستا شاكر.

١١-ئاشی شێخ كه‌ریم.

١٢-ئاشی ده‌باخانان.

١٣-ئاشی ئه‌حه توته‌له‌ی هه‌واوان له شیوی ره‌زان.

١٤-ئاشی ئاشیلكه به‌رامبه‌ر مزگه‌وتی خادم سه‌جاده.

١٥-ئاشی پێكان.

١٦-مام عه‌زیز به‌قال یه‌كێک بوو له ئاشه‌وانه‌كان كه‌باراشی ده‌برد بۆ ئاش.

جگە لەمانە مامم دەیگوت لەهەرمۆتەو شیلە و تۆبزاوا ئاش هەبووە لەگوندی جەلی لەسەر رووبای جەلی دووئاش هەبوو جاران دوو رۆژ سێ رۆژیان پێدەچو تا باراشیان بۆ دەکردن بە ئارد، مام احمد ئاشی رانیە و خۆشناوەتی هەموو چاک دەکردەوە کاتی خۆی مامۆستا حسین قادر وتاریکی لەسەر ئاش نووسی لە ژمارە٣٣/لەئەیلولی ٢٠١٤ سە رچاوەی زانیارییەکانی وەستا احمدی مامم لە ١/١/ ٢٠١٤ بەندە لەرانیە ئەم زانیارییانەم لێوەرگرت و وێنەیەکیشم چرکاند.

لە کۆیە دوو ئاشی ئاگر دامە زران یەکێکیان لەلایەن خوالێخۆشبووان کاک مجید حاجی کاکە امین و مام خدری برای ئاشەکەی دیکە لەلایەن خوالێخۆشبوو کاک عثمان عەونی و وەستا حسین نەجار بەم دواییە ئاشی سەفەری پەیدابوو تراکتەر رای دەکێشا لە کۆلانان و گوندەکان دەگەران باراشچییەکانی کۆیە ئەمانەبوون:

١- خوالێخۆشبوو واحد ئاشەوان.

٢- خوالێخۆشبوو مام مجید ئاشەوان.

٣- خوالێخۆشبوو سەیدەی باراش.

٤- خوالێخۆشبوو حەمە شەلی مام نادر.

٥- خوالێخۆشبوو مام خدر مالیان لە گردی بوو باوکی کاک سلاح.

٦- کورەکانی مام عەبدەی مام صالح کەناویان کاک عومەر و کاک عوسمان بوو.

ئێستا هیچ یەکێک لەم ئاشانە نەماون کە ئاش وەستا ئاشەوانیش دەوەستێت ئێستا کابان ئاردی بایەعی ناهێنێتەوە مال دەلێ شوێنم لێدەگرێ بەشی زۆری خەلک رۆژانە نان لەبازار دەکرێ جاران دەستاریش رۆلێکی گرنگی دەبینی لەهارێنی نیسک، ساوار، سماق، ئاشی مالان بوو مامە احمد دەستاریش دروست دەکرد دووبەردی خر

لەسەر یەک بوو بەردەکەی سەرەوە کونێکی خری لەناوەندبوو دەسکە دارێـــک بە بەردەکەی ســـەرەوەبوو ســـوراندنی لەلایەن ئەم ژنەی کە دەستاری لێدەکرد بەراستی دەستارلێکردن گەلێک جوانە بەتایبەتی لە لادێکـان لەبەر چـرا کـچ و کـور لەدەوری دەسـتار دادەنیشـن لەناکـاو یەکێک فوو لە چراکە دەکات دەیکاتە شەوی دەیجور دەبتە هەراو هۆریا هەتا چرا پێدەکرێتەوە زۆری دەوێ بەراسـتی دەستار لەدێر زەمانەوە رۆلی خۆی دەگێرا لەیەکتر نزیک کردنەوەی دلدارەکان.


مام خدر ئاشەوان


مام نەعمانە دیان


مام احمد حمد مستەفا





## زنجیره ی چل و سێیەم

**(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)**

جاران مزگەوتەکان سەرچاوەی فێربوونی خوێندەواری بوو لەدوای سوختەخانەکان مزگەوت جگە لەمە شوێنی خوداپەرستی و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەلایەتییەکانیش بوو جگە لەهەموو ئەوانەی کەباسمانکر لە مزگەوتەکانی جارانی کۆیە حوجرە هەبوو کە فەقێ لێ ی دەمانەوەو دەرسی دینیان تێدا دەخوێند وەک مالی فەقێیان بوو مزگەوتی مەلا ئەسعەد لە کاولی عەلی بەگ بوو دەکەوتە سەر شیوی رەزان حوجرەی لێبوو، مزگەوتی بایزاغا حوجرەی لێبوو خانووەک بوو بەرامبەر مزگەوت، مزگەوتی سید جامی و خادم سەجادەو، مزگەوتی حەتک، مزگەوتی قامیش، مزگەوتی رەشە، مزگەوتی منارە، مزگەوتی محموداغا، مزگەوتی پەلک، مزگەوتی مفتی.

سەرجەمیان حوجرەی فەقێیانی لێبوو بەلام بابزانین بژێوی ژیانی فەقێیەکان چۆن دا بین دەکرا نیوەرۆو ئێواران هەر رۆژەی فەقێ یەک مەنجەلێکی بەدەستەوە دەگرت دەچووە مالەکانی دەوری مزگەوت، کابانی مال دەیزانی فەقێ یە هەر خواردنێکیان هەبووایە بۆیان لەناو مەنجەلەکە دەکردن مەنجەلی فەقێ وەک مەنجەلی حەمە شێتی لێدەهات کۆیی یەکان پێیان دەگوت حەوتترینگە.

لەکۆن زۆرجار دایکم شیوی حەوت ترینگەی بۆدروست دەکردین ئەم شیوە لەبرنج سلق، کدو، پیاز، بیبەر، باینجان، تەماتە، پێک دەهات زۆرجاریش دەمان گوت دۆلمەی هەلوەشاوە هەموو ئێوارەی پێنج شەممە فەقێ تریانەیەکی بەدەستەوە بوو مال بەمالی سنوری مزگەوت دەگەرا لە دەرگای دەدا دەیگوت رابی رەحمتت لێبێ کابانیش نانێکی تیری و نیو درهەمی بۆ فەقێ دەهێناو بەروو خۆشی بەرێ ی دەکرد فەقێ دوای کۆکردنەوەی نان و پیتاکی فەقێیان بە ئەمانەتەوە پارەو نانەکەی دەبردەوە حوجرە پارەکەیان دەکردە خەرجی پێداویستییەکانیان فەقێ ی جاران بەم شێوەیە خوێندنیان تەواو دەکردو ئیجازەی مەلایەتیان وەردەگرت.

باوەڕتان هەبێ فەقێ هەبوو لە شارەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات هاتۆتە شاری کۆیە، کۆیە سەرچاوەی زانست بوو لەبیرمە لەسالانی کۆتایی پەنجاکان مەلا ئەنوەر باوکی کاک سیراج الدین ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لە مزگەوتی مەلا ئەسعەد ئاهەنگێکیان بۆ کرد هەموو کۆیە ئامادەبوو شانۆیان پێشکەش کرد هەلپەرکێیەکی خۆش کرا خوالێخۆشبووان کاک حەمە سالح جەلیزادە و کاک اسماعیل و نوری حەلە بەغدایی سەرچۆپیان دەگرت گۆرانی ئایشۆکێ وەی شێوەی شێیان دەگوت لەحەوشی لای سەرەوەی مزگەوت بەم بەشەیان دەگوت قەسرێ ئێمەی مندالیش لەسەر دیواری مزگەوت لاقمان شۆر دەکردەوە سەیرمان دەکرد وەک فلیم لەبەر چاومە جگە لەمانەی کە باسمانکردن سالانە دەروێش دەهاتن بەخۆیان و شیرو زەرگ بۆ تەکیەی تالەبانی و تەکیەی مام خەلیفەو مزگەوتی محموداغا زکریان دەکردو حالیان دەگرت و زەرگ و شیریان لەخۆیان دەدا جاری واهەبوو دەروێش لەکاتی شیریا زەرگ لەخۆدان دەکەوت و لەخۆ دەچوو خەلیفەی دەروێشان هاواری دەکرد کێ لەشی پیسە دوورکەوتەوە ئەمە فلیمی سەردەمی ئێمەبوو بەم شێوەیە کاتەکانمان بەرێ دەکرد.

فەقێ ی جاران زۆر بەزەوق بوون خاوێن بوون مندال بووین دەمانگوت فەقێ گونت تەقێ فەقێیەکان لەسەربانی مزگەوت بەردەوام ئەلە با بەیان بوو ئەوەی سەیرە فەقێیەکان هەمیشە ئاوێنەیەکی خری گچکەیان پێ بوو ناو ناو وەک مۆبایل بەکاریان دەهێنا دەیان دایە بەر رۆژ لەسەربان رووی ئاوێنەکەی لە شوێنی مەبەست دەکرد بەهەمان شێوە لەلایەکەی دیکە بەئاوێنە تیشکی تێدە گیراوەو وەلام دەدراوە بەکورتی فەقێیەکان گەنجایەتیان دەگرت لە شاری کۆیە ئێستا ٥٤ /مزگەوتی لێیە جگە لەهەبوونی قوتابخانەی ئایینی ئەمەش ناوی مزگەوت و تەکیەکانە:

١-مزگەوتی گەورە.

٢-مزگەوتی محمود ئاغا.

٣-مزگەوتی خادم سەجادە.
٤-مزگەوتی منارە.
٥-مزگەوتی سید وەلی.
٦-مزگەوتی بایزاغا.
٧-مزگەوتی مەلا ئەسعەد.
٨-مزگەوتی سیدجامی.
٩-مزگەوتی رەشە.
١٠-مزگەوتی پەلک.
١١-مزگەوتی قامیش.
١٢-مزگەوتی حەتک.
١٣-مزگەوتی گەرمک.
١٤-مزگەوتی کۆنە جمعە.
١٥-مزگەوتی ست خانە.
١٦-مزگەوت و تەکیەی مام خەلیفە.
١٧-مزگەوتی مفتی.
١٨-بەهەلە دەوترێت مزگەوتی مەلا معسوم کاتی خۆی کە خوالێخۆشبوو مەلا مەعصوم کە لە هەورامان هاتۆتە کۆیەو نیشتەجێ بووە، بووە بەمەلای ئەم مزگەوتە ناوی لکاوە بەم مزگەوتە بەڵام پێویستە بەرێوەبەری ئەوقافی کۆیە هەقی خاوەنی ئەم مزگەوتە بگەرێنێتەوە لەو حەیەک بەم شێوەیە بنوسێت مزگەوتی حاجی افندی کە دەکاتە باوکی حمدامین حاجی افندی و طاهر حاجی افندی دەکاتە باپیری خوالێخۆشبوو خارە وهاب.
١٩-مزگەوتی شەهیدان.
٢٠-مزگەوتی مەدینە.
٢١-مزگەوتی مەلای گەورە.
٢٢-مزگەوتی شەوگێراوە.
٢٤-مزگەوتی ناوداران.

٢٥-مزگەوتی خێرخوازان.
٢٦-مزگەوتی جەبار.
٢٧-مزگەوتی زانست.
٢٨-مزگەوتی جلال ئاوا.
٢٩-مزگەوتی ئیسکان.
٢٩-مزگەوتی گەشتیاری.
٣٠-شێخ طیب تالەبانی.
٣١-مجید حاجی کاکە ئەمین.
٣٢-مزگەوتی حاجی جەمال.
٣٣-مزگەوتی کانی بسکان.
٣٤-مزگەوتی روناکی.
٣٥-مزگەوتی سەفیەخان.
٣٦-مزگەوتی حاجی مژدە.
٣٧-مزگەوتی حەمامۆک.
٣٨-مزگەوتی حاجی صدیق.
٣٩- مزگەوتی ست نیعمەت.
٤٠-مزگەوتی جەوهەراوە.
٤١-مزگەتی نەجمەخان.
٤٢-مزگەوتی قازی محمد.
٤٣-مزگەوتی سەرباغ.
٤٤-مزگەوتی وەستا جلیل.
٤٥-مزگەوتی مەلا علی حاجی توفیق.
٤٦-مزگەوتی وەسییەت.
٤٧-مزگەوتی مامۆستا رشاد علی.
٤٨-مزگەوتی خانە گورێ.
٤٩-مزگەوتی زانکۆ.
٥٠-مزگەوتی حاجی رەوەند.

٥١-مزگەوتی قالە رەش.
٥٢-مزگەوت وتەکیەی تالەبانی.
٥٣-تەکیەی شێخ صدر تەنیشت مالی بابە کریم بەڵام لە دوای راپەرین نەماوە کراوە بەخانوو.
٥٤-مزگەوتی گردی کە خوالێخۆشبوو حاجی محمد دروستی کردوە لەدێر زەمانەوە شاری کۆیە شوێنی خودا پەرستی بووە هەمیشە سەرچاوەی پێگەیاندنی زانایانی ئاینی بووە.






مزگەوتی منارە



مزگەوتی شەهیدان

## زنجیرەی چل و چوارەم

**(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)**

جاران پەیوەندی لەگەل یەکترو نێوان شارەکان زۆر زەحمەت بوو وەک ئێستا نەبوو بتوانی بەئامێری سەردەمیانە پەیوەندی بکەی بەهەموو جیهان بە چرکەیەک جاران لە شاری کۆیە دائیرەی تەلەفۆن هەبوو لە ژورێکی گچکەی نیوە رۆشنی بێ خزمەت گوزاری بوو بەدالەیەکی کۆنی بیست خەتی تێدابوو بە فیشە کاری دەکرد هەموو کۆیە و گوندەکان پشتیان بەم بەدالەیە دەبەست ئەگەر تەلەفۆنێکمان بکردبایە بۆ هەولێر یا هەرشارێک دەبوو لەپێشەوە سرە بگری و ناوی خۆت تۆمار بکەی لەدوایی لەسەر کورسی یەکی رەق دادەنیشتین ئەگەر هاوین بوایە لەگەرمان هەناسەمان سوار دەبوو ئەگەر زستانیش بوایە لەسەرمان دەلەرزین لاتان سەیر نەبێ بۆ تەلەفۆنێک دەبوو چوار پێنج کاتژمێر لەچاوەروانی بووینایە.

جا ئەوەی سە یرو جێگای پێکەنین بوو فەرمانبەرە ئێشگرەکەی سەر ئامێری بەداله بەردەوام فیشەی دەردەهێناو فیشە دەخستەوە ناو هەر هاوار هاوارو دەنگە دەنگی بوو دەیان گوت هەولێر تەق تەق رێم بەردە کۆیەت لەگەلە جاری واهەبوو فەرمانبەرەکە زۆر ماندوو تورە دەبوو جنێوی سەیر سەیریان بەیەکتر دەدا لەبەر ئەم گەرە لاوژەیە خۆمان لەبیر دەکرد دەخافراین سەیرمان بەشەرە جونەکانیان دەهات جاری واهەبوو فەرمانبەرەکە لاقی لەزەوی دەدا سەری تەلەفۆنەکەی بەئامێرەکەدا دەدا، بەراستی ژیانێکی زۆر ناخۆشمان بەرێ کرد لەفەرمان بەرەبە ناوبانگ و خۆشەویستەکانی/ دائرە البرید والبرق/بە کوردی یەکەی فەرمانگەی پۆستە و بروسکە ئەم دائیرە چەند بەشێکی گرنگی هەبوو وەک بەشی بەداله بەشی پۆستە بەشی خەتەکان بەشی پول فرۆشتن لە فەرمانبەرەکانی سالانی چل تاپەنجاکان:

١-خوالێخۆشبوو مام عطا والله مامی مامۆستا ابراهیم فتح الله بەرپرسی بەدالەبوو.

٢-خوالێخۆشبوو تحسین موصلاوی بە ڕێوەبەری دائیرەبوو.
٣-خوالێخۆشبوو سعید دایی کرێکاری خەت بوو باوکی خوالێخۆشبوو عقید توفیق .
٣-خوالێخۆشبوو ناظم سعید دایی بوو بەعامل خەت دوای باوکی دوای ساڵانی ١٩٦٠ستافێکی نوێ هاتن.
١-خوالێخۆشبوو کاک سعید محمد ناسراو بە کاک سعید بروسک بەڕێوەبەری دائیرەی پۆستەو بروسکە بوو پیاوێکی کورد پەروەرو خۆشەویست بوو تا ساڵی١٩٧٤ دوایی پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلول کرد ئەمانەش ستافی بەداڵەبوون:
١-خوا لێخۆشبوو ابراهیم بەرید برای کاک اسماعیل.
٢-خوالێخۆشبوو میرزا کمال کریم.
٣-خوالێخۆشبوو مەلا سعید گورزەیی.
٤-خوالێخۆشبوو کاک حمید مستەفا سەرەنیا لەدوای خانەنیشین کردنی خارە شێخ جەمال بەرزنجی بوو بە بەڕێوبەری دائیرەی پۆستەی کۆیە.
٥-خوالێخۆشبوو کاک عبدالرزاق حەمە صدیق باخچەوان.
ئەمانە بەرپرسی خەت و کرێکارەکان ئەمانەبوون:
١-خوا لێخۆشبوو کاک قادر رشید بەرپرسی خەت بوو.
٢-خوالێخۆشبوو کاک قادر حەمە شەل کرێکاری خەت بوو.
٣-خوالێخۆشبوو مام عبداللە بەگ باوکی کاک احمدی کاتب تحریری قایمقام .
٣-کاک دلاوەر فەقێ عثمان قەساب کرێکاری خەت بوو.
٤-خوالێخۆشبوو کاک سعید صالح.
٥-کاک مولود رۆستەم بەریدی کۆیەی دەگواستەوە لەکۆیە بۆتەق تەق.
بەرپرسی فرۆشتنی پول:

١- خوالێخۆشبوو مام شێخ جەمال شێخ احمد بەرزنجی بوو لەدوای سالی ١٩٧٥ بوو بەبەڕێوبەری دائیرەی پۆستەی کۆیە.
جگە لەمانەی کەباسمانکردن فەرمانبەرەکانی پۆستە ئەمانەبوون:
١- کاک عبدالرحمن کریم برای محمد شوان رۆژانە بەیانیان زوو تۆربەو جانتاکەی لەشان دەکرد پربوو لەنامە دوکان بە دوکان نامەکانی دابەش دەکرد بەرووەکی خۆش زۆر خۆشەویست بوو ئێستا ژیان لە هەولێر بەسەر دەبات.
٢- خوالێخۆشبوو سید عزیز سید محی الدین.
٣- عبدالخالق سەید عزیز سەید محی الدین.
٤- کاک مولود مام کاکل فەرمانبەری خەت بوو.
٥- خوالێخۆشبوو کاک نادر باخچەوان.
٦- کاک ئازاد رەشید عەبود بەم دواییە بوو بەرپرسی خەت.
٧- خوالێخۆشبوو حمد عەولا رابی عامیل خەت بوو.
٨- غەفور حمدامین عامیل خەت بوو.
٩- کاک اسماعیل صادق عامیل خەت بوو.

جاران دائیرەکان زۆر لە ئێستا پێشکەوتووتربوون جاران لەناو بازاری کۆیە چەند سندوقێکی پۆستە هەبوو بەدیوار قایم کرابوو رەنگی سۆر بوو نامەیان دەخستە ناو ئەوسندوقانە بەیانیان کاک عبدالرحمن بەکلیل سندوقەکەی دەکردەوە و نامەکانی دەردەهێناو دەیخستە ناو تۆربەکەی شانی بەرەو دائیرە دەگەراوە، جاران هەموو رۆژ پۆستە دەهات لە بازاریش خوالێخۆشبوو کاک سید عبداللە سید سمایل بریکاری پول فرۆشتن بوو عەریزە نووسەکانیش پولیان دەفرۆشت وەک خوالێخۆشبوو کاک واحد حمد باوکی کاک ابراهیم لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاک عزالدین.
ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین خوالێخۆشبووکاک سەعید بروسک رۆلێکی زۆر کورد پەروەرانەی هەبوو لە سالی ١٩٦١ لەکۆیە

خۆپیشـاندان دەکـرا دژی حکـومەت کـاک سـەعید بـە بروسـکە دەنگـی خۆپێشاندەرانی دەگەیاندە حکومەتی ناوەند لە بەغدا لەسـەر خواسـتی جەماوەر لە کۆتایی هەشـتاکاندا بالەخـانەیەکی دیکە بۆ ئەم فەرمـانگەیە دروست کرا کە دەکەوێتە بەرامبەر قوتابخانەی اولی.

چەند فەرمانبەرێکی دیکە لەم دائیرەیە کاریان دەکرد لـە حەفتاکان وەک:

١- کاک نەجات غەفور.
٢- خاتوو کوردە عمر عبدالله صالح.
٣- کاک ئەنوەر حمدامین جگەرە فرۆش.
٤- خاتوو نەرمین عبدالرحمن صالح.
٥- کاک دلزار اسماعیل چایەچی.


شیخ جمال سید احمد


سعید محمد ( سعید بروسک)


عبدالرحمن عبدالکریم
(عبدالرحمن برید)


فەرمانگەی بەریدی کۆن

## زنجیرەی چل و پێنج

**(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)**

جاران هەریەکە سەرقالی کارێک بوو کردبووی بەپیشە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی تارادەیەک وای لێهاتبوو پیشە دەبوو بەپێناسەی ئەوکەسە جاران پیاوی ئیشکەر زۆر بەرێزەوە سەیر دەکرا پێشینان راستیان گوتووە کەگوتوویانە ئیشکەری مالی خۆیەتی خۆشەویستی هەمووانە لە کۆیە چەند کەسێک هەبوون حەمالیان کردبوو بە پیشە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان بەسەر بەرزی ئەوەی شایانی باسە حەمالی جاران لەتاقەت و هەلگرتنی کێش زۆر جیاوازە لەگەل حەمالی ئەم سەردەمە جاران حەمال پێ ی شەرم بوو بلێ ئەم کێشە ناتوانم هەلگرم یا بلێ دەست بارام لەگەل بگرە لە حەمالە بەناوبانگەکانی کۆیە ئەمانەبوون:

١-خوالێخۆشبوو کاک صابر مام برایم پیاوێکی قسە خۆش باری لەسەر پشت بوو بەدەم رۆیشتن بە دەنگە خۆشەکەی گۆرانی دەگوت دلی خەلکی ئارام و ئاسودە دەکرد.

٢-خوالێخۆشبوو کاک طاهر مام برایم پیاوێک پراو پربوو لەگەوهەر خۆشەویست بوو.

٣-خوالێخۆشبوو کاک سەعید هیتلەر پیاوەکی سۆرو سپی و چاوشین قسەخۆش و گالتەباز باوەرتان هەبێ ٥٠٠ /کغم لەسەر پشتی بووە ئەوجا پێ دەکەنی بەم دوایی یە لەنەخۆشخانەی کۆیە دامەزرا ئێستاش کۆیەکان بەنموونە باسی خوالێخۆشبوو دەکەن.

٤-خوالێخۆشبوو بەکر بەگ پیاوێکی کەم وێنە خۆشەویستی خەلک و هاوپیشەکانی بوو.

٥-خوالێ خۆشبوو کاک سلێمان پیاوێکی لەسەرەخۆو خۆشەویست بوو.

٦-خوالێخۆشبوو مام برایم خەلکی ناوچەی سێ سونیایەتی بوو خۆشەویست بوو.

٧-مام حەوێز خەلکی دەشتی کۆیە بوو زۆر بەهێزو قسەخۆش بوو.
٨-کاک فەتاح خۆشەویستی هەمووان بوو زۆر حەزی لەگالتە و قسەی خۆش بوو.
٩-خوالێخۆشبوو مام عبدالله خەلکی ناوچەی سێ سونیایەتی بوو پیاوێکی سۆرو سپی جوان خۆشەویست بوو زۆر بەهێزبوو.
١٠-خوالێخۆشبوو محمد خەلکی ناوچەی سێ سونیایەتی بوو زۆر لەسەرە خۆبوو.
١١-خوالێخۆشبوو کاک عمر عبدالله عزەت پیاوێکی بەهێز و دەست پاک بوو.
١٢-خوالێخۆشبوو کاک عزیز زیاتر کاری ناو بازاری دەکرد پیاوەکی خۆشەویست بوو.
١٣-خوالێخۆشبوو کاکە امین پیاوێکی بێ دەنگ خۆشەویست.
١٤-خوالێخۆشبوو مام رسول خەلکی ناوچەی سێ سونیایەتی بوو زۆرباش بوو.
١٥-خوالێخۆشبوو مام خدر خەلکی ناوچەی سێ سونیایەتی بوو پیاوەکی زۆر ژیرو خۆشەویست بوو.
١٦-خوالێخۆش بوو کاک عبدالله مام برایم پیاوێکی جوانی خۆشەویست.
١٧-خوالێخۆشبوو مام صادق اغا پیاوێکی جوانی بێدەنگ
١٨-خوالێخۆشبوو کاک مجید مام قلینجی پیاوێکی شەهید پەروەر و خۆشەویست بوو.
جگە لەمانەی کە باسمانکردن هەندێک حەمال هەبوون تایبەت بوون بەکاری داگرتنەوەی توتن پێیان دەگوتن حەمالی توتن داگرتنەوە سندوقەکیان بەکاردەهێنا بۆ داگرتنەوەی توتن ئەمانە بوون:
١-خوالێخۆشبوو کاک سلێمانی حەمال.
٢-خوالێخۆشبوو مام علی.

٣-خوالێخۆشبوو کاک مغدید مام قادر.

٤-خوالێخۆشبوو حاجی معروف.

٥-خوالێخۆشبوو عمر مام کریم.

جگە لەمانە هەندێک حەمال هەبوون تایبەت بوون بەگەراج کەنەفەرێک سەفەری دەکرد جانتایان لەسەرشانی دادەناو لەپشتی دەرۆیشت کەجانتای دەبردە ژووریّ درهەمێکیان دەدایێ جاری واهەبوو ئەگەر میوانەکە خۆشەویست بوایە یاماوەیەکی درێژ دیار نەبا ئەوە شیرین و پارەو شەکرو نوقلیان بەسەر دادەکردن بەخشیشیان دەدا بەهەلگری باول یاجانتا ئەمەی گرنگە باول لەبەرمیل یا لە تەنەکە دروست دەکرا کێشی باول قورس بوو ئەم بەرێزانە تایبەت بوون بە گەراج.

١-خوالێخۆشبوو کاک عبدالرحمن خەمانە.

٢-مام برایم.

٣-خوالێخۆشبوو مام شەریف.

٤-کاک رشاد مام شەریف.

جاران حەمال هەموو کارەکانی بەپشت ئەنجام دەدا کەرستەی حەمالی بریتی بوو لەپشتی یەک و قولابێک زۆرجار قەپانچی دەبوو دوو حەمالی لەگەل بووایە بۆکێشانی قورس جاران قەپانی دەستی هەبوو تا ٥٠٠ /کغم/ی دەخوێندەوە دەبوو دووحەمالی بەهێز بەرامبەر یەک رابەستنن دارێکی ئەستوری قەپان لەسەر شانیان دابنێن قەپانچی قولابی قەپانەکەی دەخستە ناوەراستی دارەکە سەرە قولابەکی دیکەی قەپانەکەی لەفەردەکە دەدا حەمالەکان دەبوو لەسە ر ئەژنۆبن کە دەستیان دەکرد بەکێشان حەمالەکان بەهێواشی هەلدەستانەوە قەپانچی تۆپی سەر میلەکەی دەیناو دەبرد تامیلەکە بەراستی رادەوەستا کێشەکەی بەکابرای دەگوت لەکۆیە چەند کەسێک هەبوون کاری قەپانیا دەکرد.

١-خوالێخۆشبوو کاک محسن قادر ناسراوە بە محسن قەپانچی

٢- خوالێخۆش بوو کاک صابر حەلوا لەئیستیلاک فەردە خەیارو سندوقە تەماتەی گەورەی لەقەپان دەدا.

٣- خوالێخۆشبوو کاک خدری صابر.

٤- خوالێخۆشبوو مام خدر پەستەک سۆر جاران وەک ئێستا تەرازوو ئامێری پێشکەوتوو نەبوو بۆ کێشان.

٥- خوالێخۆشبوو کاک حمید مام صالح قەپانچی یەکی باش بوو بەداخەوە سەرجەمیان مالئاواییان لەژیان کردووە.





سابیر مام برایم



## زنجیرەی چل و شەشەم

(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران ژیان زۆر سادەبوو خەلکی ژیانی لا مەبەست بوو بیری لە مۆدیل و لە خەرجی زیاد نە دەکردەوە هیچ مالێک ئامێرەکانی سارد کەرەوەو بەفر گرو پانکەو ئامێرەکانی سەردەمیانەی نەبوو پێک هاتەی ناو مالی هەژارو دەولەمەند پێک هاتبوو لەیەک دوو شرە لبادو کۆنە بەرەو چەند مەنجەل و قاپێکی ئاسنجاوو کوپێکی ئاوو چەند گۆسکەو هیزەو شەربەیەک و چەند جاجم و دۆشەگ و لێفەی خوری و چرا رەشکەیەک و سۆپەیەکی دارو مقارەیەکی خەلوزو سێرو سێ کوچکەو تەشتی هەویرو تەنەکەیەک نەوت و پریمزێکی گچکەو چەند بارێک دار کە پاییز دادەهات هەموو خانەوادەیەک گەنمی سالانەی عەمبار دەکرد لەگەل کرینی نۆک و نیسک و ماش تەماتەی دەکرد بەئاو بۆ زستان بەکاری دەهێنا باینجان و بامیەو هەنجیریان وشک دەکردە وە ساوارو گەنمەکوتاو داندۆک و کەشک و قاورمەیان بۆ زستان ئامادە دەکرد سەربانیان بەقور سواغ دەدا نەوەک خانوەکان دلۆپە بکات بەم سادەییە خەلک دەژیا کەم خانەوادە رادیۆی هەبوو شەوانیش پێش نوێژی خەوتنان دەنووستین بەیانیان زوو هەلدەستاین.

خانووی جاران هەمووی قور و دار بوو شێوەی دروستکردنی شەرقی بوو دەرگای مالآن داربوو کێلونو سویچی نەبوو بەپشک دەرگا دادەخرا کلیلی دەرگا داربوو سێ پشکی لەسەر دروست کرابوو هاوینان هەموو خانەوادەیەک لەسەربان دەنووست ئێوارەی هاوینان هەموو خانەوادەیەک ستلە ئاوێکی دەبردە سەربان و ئاورشێنی دەکرد دوایی لبادیان بەسەر دەخست و رایان دەخست کەئێوارەش دادەهات سەرجەم ئەندامانی خێزان ئامادە دەبوون بۆ نانخواردن چێشت بۆ ئێواران لێدەنرا چێشتی جارانیش نیسک یا ماش یا نۆک یا مزەورە یا جلبرۆکە واتە هەرشتە یان دەکردە ناو تەماتاو جاران دەبوو سەرجەم ئەندامانی خێزان پێکەوە نان بخۆن و ئامادەبن.

ئەوەی سەیرو سەمەرەبوو خەلکی کە لەسەربان دەنووست شەو هەر جولەیەکی بکردبایە یا قسەی بکردبایە ئەوە جیرانەکەی بە گوێ دەیبیستو بە چاویش دەیدیت بەیانیان کەهەلدەستاین ئەم خەلکە هەمووی نووستووە و راکشاوە بێ لێفەو بەتانی بەراستی جاران خەلکی زۆر بێ فێل بوون گەورەبووین هیچمان نەدەزانی بە دەگمەن هەندێک خانەوادە تەخت و چیغیان هەبوو هەندێکیش پەرۆیان دەگرتەوە پێیان دەگوت کوللە هەموو مالێک شەربەیەک ئاوی لەسەر رۆخی دیوار دادەنا لەگەل جامولکەیەک.

ئەمەی گرنگە زۆر جار رەشەبای کۆیە تەخت و چیغی تێکدەدا جاران هەندێک کەس لەشەوا شینک و چرو شوێن و کەپری نووستنی دروست دەکرد شەو هەر بجولا باوە خشەخشی دەهات بۆ خۆشیتان مالی سید حەسەن لەنزیک دەباخانان بوو کە دەکاتە باوکی سەیدە ئەمین شەو ژن و پیاوی جیرانەکەیان پێک نایەن هەر خشەخشیانە سەرەرای ئەمە جارجار ژنە لە ناو جێگاکەی رادەکا لە دەست پیاوەکەی پیاوەکەش جاری واهەبوو ژنەکەی رادەکێشا مام سەید حەسەن خەوی لێ ناکەوێ هەرجارێک کە خشەخشیان لێوەدێت مام سەید حەسەن دەلێ خت خت کە گوێیان لەخت خت دەبوو ژن و پیاوەکە ماوەیەک بێ دەنگ دەبوون پاش ماوەیەکی دیکە هەمان بەزمیان دەکردەوە مام سەید حەسەن بێزار دەبوو لەناوجێگاکەی خۆی دەنگی بەرز دەکردەوە دەیگوت خەجێ خێرت دەگاتێ رازی کە با بنوین مام سەید دوکانی لەسەر کۆسپەکەی ناو دەرگای قەیسەری کۆن بوو ئەو رۆژە بەیانی زووهاتە سەر دەزگاکەی پینە دۆزبوو خەوی لێکەوت جیرانەکانی بازار گوتیان سەید دەلێ ی نەنووستووی لەوەلامدا گوتی بەزمی خەجێ لێدەگەرێ کەس بیۆرژێ.

لەگەڵ رۆژهەلات هەموو کەس سەر قالی کارو کاسبی خۆی بوو ئێمەی قوتابی لەگەل مەلا بانگدان هەلدەستاین لەبەر چرا دەرسمان دەکرد بەراستی ژیانی جاران تام و چێژی خۆی هەبوو کە ئێوارە

دادەهات منداڵی گەرەک هەمووی سەرو پەرۆیەکی پێ بوو لەگەڵ ئانەیەک دەچووینە بازار لای بەفر فرۆش بەفرمان دەکری و دەمان خستە ناو پەرۆکە بۆ ماستاو و دۆ ساردکردن کە بەفرمان دەکری هەندێک بەفرمان لەبەفر فرۆشت وەردەگرت دەمانگۆ خاترانەمان بدەیە لەرێگای گەرانەوە دەمان خوارد.

دوو جۆر بەفر هەبوو جۆرێکیان بەفری خوایی بوو جۆرەکەی دیکە سەهۆڵ بوو لە کارگەی کاک مجید حاجی امین دروست دەکرا کە یەکەم کەس بووە کارگەی دروستکردنی بەفر و ئاشی ئاگری هێناوەتە کۆیە لەپەنجاکان کاک فاریق بە پیکابە شوفرلێتە مۆدیل ١٩٥٦بەفری دەهێنا ناوشار و دابەشی دەکرد جاران هەندێک هەبوون پیشەیان دروستکردنی چالە بەفربوو لە زستان کرێکاریان لەگەڵ خۆیان دەبردە چیای باواجی و نزیک فەقێیان لەم دوو شوینە چالیا ئامادە دەکرد پریان دەکرد لەبەفری خودایی سروشتی باش دەیان پەست دوایی کایان لەسەر دادەناو بەقور جوان سواغیان دەدا تا هاوین لە کاتی گەرما چالە بەفرەکانیان دەشکاند هەر رۆژە هەندێک لەم بەفریان لەناو تێر دەکردو بەوڵاخ دەیان هێنا شارو پێداویستی ناو شاریان جێ بەجێ دەکرد و بژێوی ژیانیان پێ دابین دەکرد وەک باسم کرد هیچماڵێک سەلاجەی نەبوو ئەمانە لەکۆیە دەچوونە چالە بەفران.

١-خوالێخۆشبوو رشید مام قادر چایەچی.

٢-خوالێخۆشبوو عبد الله مام یەحیا.

٣-خوا لێخۆشبوو سەعید مام رەزا.

٤-خوالێخۆشبوو مام رەزا مام یەحیا.

٥-خوالێخۆشبوو مام خەزایی.

٦-خوالێخۆشبوو عبدالله رشید.

٧-خوالێخۆشبوو جمال مستەفا سوسکە.

٨-خوالێخۆشبوو مامە جاف حەمە عەلی.

٩-خوالێخۆشبوو مام خدر قەیاغچی.

١٠-خوالێخۆشبوو مام خدر پەستەک سۆر.

١١-خوالۆخۆشبوو مستەفا خدر باوەکر.

دوای دانانی کارگەی بەفر پیشەی چوونە چاله بەفر بەرەونەمان چوو لەسالەکانی سەرەتای حەفتاکان شارەوانی کۆیە کارگەیەکی بەفری دامەزراند لەسەر رێگای حەمامۆک دوایی لەکۆتایی هەشتاکان لەکارکەوت لەهەمان شوێن کاک شوان رەفیق ئاسنگەر کارگەکەی چاک کردەوەبەئیشی خستەوە لە ناوەراستی حەفتاکان خوالێخۆشبوو دلشاد حاجی کریم ئاسنگەر کارگەیەکی بەفری لەتەق تەق دامەزراند بەرهەمەکەی دێنتە کۆیەو گوندەکانی دەوروبەر ئێستا هەرسێ کارگە کاردەکەن.

جاران بەیانیان زوو لەگوندی حەمە بایزان و کا فرۆشیان و تۆبزاواو شیله و هەرمۆتە دۆیان بەمەشکە دەهێنا کۆیە بەسواری گوێ درێژ لەکۆلانان پیرەژن دەیان گەراند بەجا مولکە دەیان فرۆشت ئەمانەی کە دۆیان دەفرۆشت چەند ژنێکی بەرێزی بەتەمەن بوون:

١- پور ئەسران.

٢- پور ئالتون.

٣- یاخەزار ئێواران بەفریان لەناو قاپی چینکۆ دەکرد بەمراکی ماستاوی دار پێیان دەگوت کۆتکی ماستاو دەیان خواردەوە باوەرتان هەبێ گەلێک خانەوادە ئێواران نان و دۆیان دەخوارد مندال قەناعەتی هەبوو دایک و باوک چی بخواردبایە ئەویش دەیخوارد جگە لەمانەی کەباسمانکردن بەفر فرۆشەکانیش ئەمانەبوون:

١- خوالێخۆشبوو کریم حەمە شەل.

٢- خوالێخۆشبوو رشید قادر چایەچی.

٣- خوالێخۆشبوو حمد حاجی ئۆمەر.

٤- خوالێخۆشبوو کاک میرزا عبداللە مام یەحیا و کاک دلشادی برای.

٥- خوالێخۆشبوو عبدالرزاق عادی لان.

٦- خوالێخۆشبوو مام بەکر عەودالانی.

خۆشترین کاتمان بوو ئێواران کە دەچووین بۆ بەفرکرین هەروەک باسمانکرد لەمەو پێش هیچ مالێک سەلاجەی نەبوو بۆ هەلگرتنی خواردن و ماست و گۆشت لەپەنجاکان پشتیان بەکوپە دەبەست بۆ خواردنەوەی ئاوی سارد کوپەکەیان لەشوێنێک دادەنا سێبەر بووایە جێ کوپیان بە بەردو قسل دروست دەکرد گیا کوزەلەیان لەدەور دەچاند لەژێرەوە بن کوپ هەبوو خواردنیان لێ دادەنا چونکە فێنک بوو هەمیشە دلۆپە ئاوی کوپەکەی دەهاتە خوارێ شەوانیش لەترسی پشیلە خواردن و ماست و گۆ شتیان دەبردە سەربان لەناو تەشتەک ئاویان دادەنا لەبەر فێنکی زۆرجاریش هەبوو پشیلە پارتیزانیانە خۆی تێدەکرد لەنیوە شەو گۆشتەکەی دەفراند بەلام لەسەرەتای شەستەکان سندوقەکی دار پەیدابوو ناوەکەی پلێت بوو خەلکی بەفرو خواردن وگۆشتی دەخستە ناو وەک سەلاجە بوو بەراستی ژیان گران بوو.

## زنجیرەی چل و حەوتەم

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران شاری کۆیە تا کۆتایی پەنجاکان چوار گەرەک بوو هەرهەموو خانەوادەکان یەکتریان دەناسی و خزمایەتی و خۆشەویستیان لەنێوان دابوو ئەگەر خانەوادەیەک کارەساتێکی بەسەر هاتبایە ئەوە خەلکی شار هاوکارو یارمەتی دەری دەبوون تارادەیەک خۆشەویستی لەنێوان دانیشتووانەکە هەبوو خەلکی شارەکانی دی بە کۆیەکانیان دەگوت کۆیاتی و خۆیاتی.

جگە لەمانەی کە باسمانکرد لەم شارە سێ ئاینزا هەبووە مسولمان، دیان، جولەکە، کۆیەکان هیچ کاتێک جیاوازیان نەکردووە تارادەیەک خۆشەویستی هەبووە لەسەرجەم بۆنەوتازیەکان بەشداری یەکتریان کردووە جگە لەمانە زۆر ڕێز لەدێری جولەکەکان و کەنیسەی دیانان گیراوە لە کۆیە چوار موختار هەبووە کەکاروباری خەلکیان ڕاپەراندوە کێشەکانی گەرەکیان چارەسەر کردووە جاران وەک ئێستا نەبوو خەلکی گەرەک خۆیان یەکێکیان هەلدەبژارد بۆ ئەوەی ببێ بە موختار حکومەت مووچەیەکی پێدەدا موختار خۆشەویست بوون بەڵام دوای هەشتاکان ڕژێمی بەعس خۆی موختاری دەست نیشان دەکرد لە موختارەکانی کۆیەی جاران.

١- خوالێخۆشبوو مام واحد ناسراوبوو بە واحد موختار باوکی شەهید جەعفەر بوو موختاری گەرەکی بەفری قەندی بوو.

٢- خوالێخۆشبوو مام صالح موختاری گەرەکی بایزاغا بووە کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبووان باقی حلاق و کاک عبدالرحمن دوای مردنی کاک عبدالرحمن دەبێ بە جێگرەوەی بۆ زانین ئەم گۆرانی و مەقامەی کە مەلا ئەحمەدە کۆرە دەیلێ بەناو نیشانی خالە موختار لەسەر مام صالح گوتراوە.

٣- دوای کۆچی کاک عبدالرحمن مام صالح کە بەکارەبا شەهیدبوو لەکاتی کاری فەرمی خوالێخۆشبوو مام رەفعەت عەلاو بوو بە موختاری گەرەکی بایزاغا.

٤- خوالێخۆشبوو مام احمد لاکین موختاری گەرەکی هە واوان بوو.

٥- خوالێخۆشبوو کاک جلال حمد بەگ موختاری گەرەکی قەلات بوو هیچیان لەژیان نەماون تا ئەم ساتە خەلکی بە باشە ناویان دەهێنێ.

لە ناوەراستی حەفتاکان چەند پیاوەکی دیکە کران بە موختاری گەرەکەکان:

١- خوالێخۆشبوو رەسول حەمەلاو موختاری قەلات.

٢- خوالێخۆشبوو حمید مام صالح موختاری بەفری قەندی.

٣- خوالێخۆشبوو محمد مەنگور موختاری بایز اغابوو.

٤- مام سەلیم ناسراو بە سەلیمی موختار موختاری هەواوان بوو موختارەکانی ئەم دواییە پارەیان وەردەگرت بۆ راپەراندنی کاروباری فەرمی چونکە لە حکومەت مووچەیان نەبوو ئەوانەی موختاربوون تا ئێستابووە بە پێناسەیان بەمە دەناسرێن جاران موختار لە دائیرەی سەرا دادەنیشت عەریزە نووسیش لەبەر دەرگای سەرا کاری خۆیان دەکرد هەموو عەریزەیەک دەبوو پولەکی٥٠/فلسی پێوەبێ لە کۆیە ئەمانە عەریزە نووس بوون:

١-خوالێخۆشبوو کاک واحد.

٢-خوالێخۆشبوو کاک نجم الدین.

٣-بەم دواییە مامۆستا غەنی مەجید عەریزەی دەنووسی عەریزە بە دەست دەنووسرا هیچ ئامێرێکی نووسینیان نەبوو وەک ئێستا ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین عەریزە نووس کاربۆنی لەبن وەرەقەکە دادەنا لەجیاتی کۆپی جگە لەهەموو ئەم زانیاریانە لەسالانی ناوەراستی پەنجاکان بەدواوە گەرەکی گردی جولەکان دابەش کرا لەلایەن خوالێخۆشبوو قایمقامی ئەوکات بەرێز هادی چاوەشلی لەبیرمە یەکەم

خانووکە لەگردی دروست کرا خوالێخۆشبوو وەستا مستەفا دۆندرمە دروستی دەکرد دوایی مام حەمرەس، کاک مەهدی چایەچی، مام تاهیر مەلا حەبیب، کاک سەید برایم، مەلاحەمید خانوویان دروست کرد، ئێمەش لەریزی پێشەوە خانوومان دروست کرد لەساڵانی ناوەراستی شەستەکان ئیسکان دروست کرا لەلایەن حکومەت ئەندازیاری سەرپەرشتی گەرەکی ئیسکان خوالێخۆشبوو کاک عبدالخالق فتاح اغا حوێزی بوو.

بەم شێوەیە کۆیە بوو بەشەش گەرەک ئێستابووە بەچل و پێنج گەرەک ئەوەی وای کرد کە کۆیە بەم شێوەیە گەورەبێ و فراوان بێ لە دواساڵەکانی هەشتا گوندەکان چۆلکران و ئەنفال کران جگە لەمە لەشەری برا کوژی لە ١٩٩٦خەلکێکی زۆر ئاوارەی شاری کۆیە بوون و تێیدا نیشتەجێ بوون بەڵام لەرووی خزمەت گوزاری زۆر دواکەوتووە کە نەدەبوو وابێ.





## زنجیرەی چل و هەشت

(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران وەک ئێستا نەبوو خەلکی گوێ بەخەم و ناخۆشیەکانی خزم و هاوسێ و هاوشارەکەی خۆی نەدا هەرکەسێک رووبەرووی رووداوێکی نەخوازراو بوایە ئەوە گەورەو بچوک بەرەو ئەو شوێنە دەچوون لەبیرمە لە١٩٥٦/٦/٤بوو لافاو هەلسا لەرووباری دارکەران واتە شیوی رەزان پیاوێکی قەیاغچی بەناوی عەدەبەرەک ئاو بردی خۆی و ولاخەکەی هەموو کۆیە گەورەو بچوک لەشیوی رەزان دەگەران بە دوای جەنازەکەی تاگرتیانەوە لەنزیک گۆمی کەونە پرد ئەوکات مندال بووم لەبیرمە خانووی کاک عومەر باش کاتب لەتەنیشت کۆنە بلدیە رووخا مندالەکانی کەوتنە ژێر خانووەکە هەموو خەلکی کۆیە بەهانایانەوە چوون لە١٩٦٣/٧/٤ لەکاتی شەهیدکردنی خوالێخۆشبوو خاتوو منیرەی مەلا تاهیر جەلیزادەو کۆرپەکەی بەناوی شوان بەدەستی تاوانبارە حەرەس قەومی یە بەعسیەکان باوەرتان هەبێ لەم رۆژە ترسناکە ژنی گەرەک تەرمەکانیان خستنە سەر قادرمەی دارو بردنیان بۆ نەخۆشخانەی کۆنی کۆیە ئەمە هەلوێستی خەلکی کۆیەیە جگە لەمانە هەر خەلکی کۆیەبوو باوەشی بۆ ئاوارەرو کەس و کاریی ئەنفالکراوان گرتەوە باوەش بۆ کوردی ئاوارەی هەرچوار پارچە گرتۆتەوە.

بەراستی حاجی راستی فەرمووە کە گوتوویەتی لە حاتەم زیاترن وەختی سەخاوەت جگە لەمانە لە ١٩٧٩/٨/١١ لە رۆژێکی ترسناک بێ گوێدانە بەعسی یە خوێن رێژەکان کۆیەکان بەشداریان کرد لە بەخاک سپاردنی پۆلێک پێشمەرگەی شەهیدکە لەقورە بەرازە شەهیدکران بەسەرکردایەتی شەهیدی نەمر شەفیق زاهیر کریم.

جگە لەمانەی کە باسمانکردن لەکۆیە چەند کەسێک هەبوون لەکاتی مردنی هەرکەسێک دەولەمەندبا یا هەژار بەخێرایی رێورەسمی

شۆرین و قەبرلێدان و بەردهێنان لە چیا بەپشتی ولاخ و ناشتنی بۆ مردووەکە جێ بە جێ دەکرا ئەم سێ پیاوە خێرخوازە ئەمانەبوون:

١- خوالێخۆشبوو مام عەولا جەیدی.

٢- خوالێخۆشبوو وەستا محی الدین قەبر هەڵکەند.

٣- خوالێخۆشبوو مەلا قادر ناسراو بە مەلا قالە.

جاران ئەگەر یەکێک بە شەو بمردبایە ئەوە هەرهەمان کات سەرما و بەفربایە خەلکی شار بەخۆیان و چادرەوە دەچوونە گۆرستان تا هەموو کارەکانیان ئەنجام نەدابایە نەدەگەرانەوە بۆیە هەقمە شانازی بە شارەکە م بکەم لەحەفتاکان بەدواوە خوالێخۆشبوو مام حەسەن قولی، حاجی طاهر وەستا محی الدین بەکاری مردوو شاردنەوە و قەبرلێدان هەلدەستان بێ ئەوەی خاوەن مردوو هیچ خەرجی یەک بکات ئەم پیاوە خێرخوازانە پارەیان لە خێرخوازانی شار وەردەگرت بەردە قەبرو پێداویستییەکانیان پێ دابین دەکرد بەڵام لەدوای راپەرین هەندێک رێورەسمی نوێ لە کۆیە پەیرەو دەکرێت بۆ بەرێ کردنی پرسە کۆیی یەکان دەستیان کرد بە دروستکردنی هۆلی تایبەت بەپرسەی ژنان لەگەرەکەکان ئەم هۆلانە هەموو پێداویستیەکانی میوان بەرێ کردنی تێدایە کۆیی یەکان کاری دروستکردنی هۆلی پرسەی ژنانیان بردە هەولێریش.

ئێستا لەکۆیە نووسینگەیەکی خێرخوازی هەیە بۆ لێدانی قەبر بۆ مردووەکان سەرپەرشتی پرسەش دەکات ئەم کارە لەلایەن خێر خوازێک بەرێوە دەبرێت بەناوی مامۆستا ئیبراهیم علی ئەمین بەبێ بەرامبەر ئەم کارە دەکات هەرکاتێک پەیوەندی پێوەبکرێت بە ئەرکی خۆی هەلدەستێت چەند پیاوێک بەکاری قەبر لێدان هەلدەستان دوای راپەرین:

١- کاک کەمال مام مستەفا.

٢- کاک حەسەن عەدیلان.

٣ - کاک عمر بەسێ.

له کۆتایی پەنجاکان ئەگەر یەکێک لەم شارە بمردبایە خەلکی شار خواردنیان بۆ مالی مردووەکە دەبردەوە هەبوو نیوەرۆ خواردنی دەبردەوە هەبوو ئێواران خواردنی دەبردەوە بەم خواردنەیان دەگوت سفرە خواردنی سفرە پێک هاتبوو لە سێ بەلەمی شوشە پلاو برنج لەگەل مەنجەلەکی مام ناوەندی مەرەگە و چەند نانێک ئەمانەیان لەسەر سینی یەک دادەنا پێش بانگی نیوەرۆ یا پێش بانگی ئێوارە حەمالێک دەهات کە پێشتر ئاگادارکراوەتەوە سینی یەکەی دەخستە سەر سەری و بەپەرۆیەکی سپی دایان دەپۆشت بۆ مالی مردووەکەی دەبرد لەبەر دەرگای مالی مردووە کەیەکێک لەحەمالەکەی دەپرسی ئەم سینی یە هی کێیە دەیگوت مالی فلان ناوەکەیان دەنووسی بۆ ئەوەی خاوەن پرسە بزانێت کێ هاوکاریان بووە حەمال کە سفرەکەی دەگەیاندە مالی مردووەکە تەنها سینی یەکەو پەرۆکە سپی یەکەی دەهێناوە لەگەل خۆی.

ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین خاوەن سفرە لەکاتی نان خواردن ئامادە دەبوو بەشدار دەبوو لەنان خواردن لەگەل خاوەن پرسە دوای نان خواردن و چا خواردنەوە خەلکە کە هەلدەستان هەرکەس بۆ شوێنی خۆی رۆژی دوایی کابانی مال دەچووە مالی خاوەن پرسە سێ بەلەمە شوشەکەو مەنجەلە گچکەکەی دەهێناوە کابان بەلەم و مە نجەلەکەی بەنیشانکردبوو هەتا ناوەراستی سالەکانی حەفتا سفرە بەم شێوازە بوو دوایی سفرە بەمەنجەل دەناردراوە مەنجەلێک پلاو برنج لەگەل مەنجەلێکی گچکە مەرەگە چ بامیە یا چ کدو یابایىنجان یا فاسۆلیا یا پەتاتە نەدەبوو مەرەگەی قەیسی بنێردرێتەوە لەدوای راپەرین ئەم داب و نەریتەش گۆرا خەلکی شار لە جیاتی خواردن فەردە برنج یا شەکر یا کارتۆنە روون یا تەماتە یا مریشکی دەبردەوە بۆ مالی خاوەن پرسە خۆیان خواردنیان ئامادە دەکرد هەرکەس ئەم شتانەی ببردباوە لەگەل خاوەن پرسە نانی دەخوارد بەلام لەدوای سالانی ٢٠١٠/ ز، ئەم نەریتەش گۆرا ئێستا کەس شت

ناباتەوە خاوەن پرسە خۆی نان و چێشت ئامادە دەکات تا سەرەتای سالی ٢٠٠٠ /ز ماوەی پرسە سێ رۆژ بوو ئێستا بووە بەدوو رۆژ خەریکە هێواش هێواش ماوەکە کەم دەبێتەوە. دوای بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆنا بەیەکجاری پرسە نەما.

بەراستی داب و نەریتی جارانی کۆیە زۆرجوان بوو ئێستا خاوەن پرسە سەریشی دەچێ مال وێرانیش دە بێ لەشاری کۆیە سێ گۆرستانی گەورەی لێ یە:

١- دەرویش خدر لەسەر شیوی رەزانە.

٢- کەکۆن یاگردی کەکۆن یا گردی قشلە.

٣- گردی عەرەبیان یا غەریبان یاگردی شەهیدان.

دایکی رەحمەتیم دەیگوت بۆیە پێیان گوتووە گردی عەرەبیان چونکە کاتی خۆی عەرەبی کۆچەر دەهاتن بەحوشتر خوێیان دەهێنا لەسەر ئەم گردە بارەکانیان دەخست و پشوویان دەدا لەبیرمە عەرەب بەحوشتر دەهاتنە گوندی جەلی لە کۆتایی پەنجاکان جگە لەمە ئەگەر غەریبێک بمردبایە لەم گردە بەخاکیان دەسپارد لەکۆتایی سالەکانی حەفتا ناوی ئەم گۆرستانە گۆراوە بووە بەگردی شەهیدان چونکە رۆژی واهەبووە بەهەژدە شەهیدی شۆرشی نوێ لەم گۆرستانە بەخاک سپێردراوە کە سەرجەمیان لاوو گەنجی شۆرشگێری ئەم شارەن جگە لەم گۆرستانانە هەندێک گۆرستانی دیکەش هەبوون وەک گردی فەقێ لەسەر جسری ئازادی بوو گردی شێخ مستەفا لەتەنیشت بنکەی تە ندروستی دەرگای خۆشناوەتی، گردی مەلا مەحمود لەبەرامبەر بلدیەی کۆنی کۆیەیە کراوە بە خاک گۆرستانی، گردی جولەکان بووە بەخانووی نیشتەجێ بوون، گەرەکی جمعیە لەکاتی دابەشکردنی لەسالی ١٩٧٠/ ز گۆرێکی زۆری لێبوو زۆری گۆرستان لەم شارە ئەوە دەسەلمێنێ کە کۆیە شارێکی کۆنە لەمێژوودا.

جگە لەمانەی کە باسمانکردن قەبر لەسەر قازیلان هەیە پشت مزگەوتی محمود ئاغا لە نزیک قوتابخانەی اولی پیاو چاکی شێخی شێخ

موسىێ هەیە ئەمەی شایانی باسە گۆرستانی دەروێش خدر تاییەتە بەمردووەکانی گەرەکی بایز ئاغاو هەواوان گۆرستانی کەکۆن تاییەتە بە مردووەکانی گەرەکی قەلات گۆرستانی شەهیدان تایبەتە بەمردووەکانی گەرەکی بەفری قەندی هەندیک بنەماله ی بەفری قەندی لەکە کۆنیش مردوویان ناشتووە.

حاجی رەزا مام عوسمان رۆلێکی گرینگی هەبوو بەدابینکردنی کفن بۆ مردووەکان بەخۆرایی خوالیخوشبووی دایکم بۆی گیرامەوە کەبازرگانیکی جوولەکە بەناوی(سلمان حاتان) کفنی دەدا بە مردووی موسولمانان لەشاری کۆیە بەبی بەرامبەر بەتایبەتی بو هەژاران ماری ئەم جوولەکەیە لەپشت بانک بوو.





## زنجیرەی چل و نۆ

(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران هەریەک لەم شارە سەر قالی کارێک بوو بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی شاری کۆیە سروشتێکی جوانی هەیە بەرەز و باخچەی دلرفێن دەورە دراوە جوانی دیمەنی شیوی رەزان لە هۆنراوەی حاجی قادرو مەلا عاصی رەنگی داوەتەوە حاجی دەلێ:

نمونەی جەنەتە شیوی رەزانی

بەهاری شامە ئەیامی خەزانی

مەلا عاصی دەلێ:

من کە کۆیەم سەیری باغ و مەنزەرەم

گەر بێتو لوبنان من ببینێ بێ شک دەگرێ وەرەم

چەند بنەمالەیەک هەبوون لەم شارە کارو پیشەیان رەزەوانی بوو بەتایبەتی بنەمالەی هەواویەکان جگە لەرەزەوانی خەریکی راویش بوون بەتانجی رەزەکانی دەوری کۆیە لەسەر چاوەی ئاوی حەمامۆک دەستی پێدەکرد بەرەو خوار تا دەگاتە ئۆمەر خوچان و نزیک گوندی چەمبەرە بە درێژایی ئەم رەزانە رووباری دارکەران واتە رووباری شیوی رەزان درێژ دەبێتەوە بالەحەمامۆکەوە ناوی رەزەکان باس بکەین لەگەل خاوەنەکانیان.

١-رەزی ساغە خاوەن داریەتیەکەی دەگەرێتەوە بۆ خوالێخۆشبوو مام عەبدە مام صالح باوکی شەهید ئاودێر.

٢-رەزی خوالێخۆشبوو مام حاجی بایز مام کەریم بەکرێ ی گرتبوو سەوزەو میوەی لێ بەرهەم دەهێنا.

٣-رەزی مالی کاک فخری حەوێزی لە نزیک سەرچاوەی حەمامۆکە..

٤-رەزی حاجی سابیر کە بوو بەهی مەجید سابیرو شەفیق سابیر بەلام کاک مەجید سەرپەرشتی رەزەکەی بۆ دەکردن.

٥-رەزی مام خدر بەرامبەر قەسرێ جاران ئاشەکی ئاوی لێ بوو.

٦-رەزی کاک محی الدین غەفوری.

٧-رەزی مالی خوالێخۆشبوو کەریمە سور.

٨-رەزی خوالێخۆشبوو خارە حمید باوکی شەهید اکرم.

٩-رەزی عومەر ئاغای شەوگێر باوکی شەکرە و بەکر.

١٠-رەزی مفتی کە خوالێخۆشبوو کاک محمود کاکە سەرپەرشتی دەکرد ئەمەی شایانی باسە ئەم رەزە شوێنەکەی زۆر بەرز بوو دار ئەرخەوانێکی گەورەی تێدابوو هەر زوو مژدەی بەهاری بە کۆیە رادەگەیاند، خاوەنداریەتییەکەی بۆ بنەماڵەی مفی دەگەڕێتەوە.

١١-رەزی خوالێخۆشبوو عەبدەی سەلام.

١٢-رەزی خوالێخۆشبوو ست خانە لەسەر پردی دەروێش خدرە حەمە غەفور سەرپەرشتی دەکرد.

١٣-رەزی خوالێخۆشبوو عمرحاجی محمود.

١٤-رەزی خوالێ خوالێخۆشبوو باقی ئاغا.

١٥-رەزی کاک نەجات کاکە حاجی محمود.

١٦-رەزی خوالێخۆشبوو عادل ئاغا کریم حاجی خەلیفە سەرپەرشتی دەکرد.

١٧-رەزی مالی خوالێخۆشبوو تاهیر چەلەبی شەهید بەکر مەلا عبدالله سەر پەرشتی دەکرد.

١٨-رەزی خوالێخۆشبوو مام تایەرە گۆچ لەگەل کورەکانی سەرپەرشتیان دەکرد کاک عمر، کاک ابراهیم، کاک اسماعیل.

١٩-رەزی مام عبداللە باوکی کاکە سوار ئێستا بەمولک بووە بەهی سەید رابەر.

٢١-رەزی مالی خورشید اغا کە حاجی خەلیفە سەرپەرشتی دەکرد.

٢٢-رەزی خوالێخۆشبوو مەجیدی مێرەمێ.

٢٣-ڕەزی مـالی خوالێخۆشـبوو جـلال حـوێز کە خوالێخۆشـبوو ڕەفیق قالە ڕەش سەرپەرشتی دەکرد ئێستا بووە بەهی کاک شێردل حەوێزی.

٢٤-ڕەزی خوالێخۆشبوو حـاجی سـەعید احمـد کـە سـۆفی قـادرو کورەکـانی خـدر، مسـتەفا، ئـەمـین، سەرپەرشـتیان دەکـرد ئێسـتا مولکەکەبووە بەهی کاک محسن احمد.

٢٥-ڕەزی خوالێخۆشبوو کاک ئەرشەد ئاغـا ئێستا بووە بەمولکی سـەید ڕابەر پێش فرۆشـتنی خوالێخۆشـبوو امـین عبداللـە سەرپەرشـتی دەکرد.

٢٦-ڕەزی خوالێخۆشـبوو کـاک حەمـە سـەعید کە خوالێخۆشـبوو صـابری قەسـاب سەرپەرشـتی دەکـرد هاوینـان چایخـانەی تێدا دادەنـا لەسەر جسری ئازادی یە.

٢٧-ڕەزی مـالی خوالێخۆشـبوو کـاکە زیـاد کە خوالێخۆشـبوو حەمەی قـالە ڕەش سەرپەرشـتی دەکـرد لەسـەر جسـرێیە خـوار قوتابخانەی سەرباغ.

٢٨-ڕەزی تـایەر چەلەبـی کە خوالێخۆشـبوو ڕەفیـق مەلا عبداللـە سەرپەرشتی دەکرد لە گۆمی کەونە پردە.

٢٩-ڕەزی کاکە سور عەبدە ئاغا کە خوالێخۆشبوو حسین مـام طە سەر پەرشتی دەکرد لەکەونە پرد تێدەپەڕی بەرەو ئۆمەر خوچان.

٣٠-ڕەزی خوالێخۆشـبوو کـاکە سـور کە خوالێخۆشـبوو حمـد مستەفای حەوێزی سەرپەرشتی دەکرد.

٣١-ڕەزی مستەفا ئاغـا بـاوکی مامۆسـتا احمـد دلـزار مـام صـابر حەمە غەفور سەرپەرشتی دەکرد سەردەمانێک خەلکی کۆیە بەهاران بۆ سەیران دەچوونە ڕەزەکانی ئۆمەر خوچان.

٣٢-ڕەزی خوالێخۆشبوو ئەحمەد شینە بەرامبەر ئۆمەر خوچان.

٣٣-ڕەزی خوالێخۆشبوو صدیق شینە خوار ئۆمەر خوچان.

٣٤-ڕەزی خوالێخۆشبوو کاکل حەمە قەوان ڕەزی ئەوقاف بوو.

٣٥-ڕەزی خوالێخۆشبوو صمد ئاغا کە خوالێخۆشبوو تۆفیق قالە ڕەش سەرپەرشتی دەکرد دوای ئەو ئێستا کورەکەی کاک شفیق سەرپەرشتی دەکات.

٣٦-ڕەزی خوالێخۆشبوو سمایل تیمارۆکی پێش چەمبەرە.

٣٧-ڕەزی خوالێخۆشبوو قالە دزەیی ئێستا بەڕەزی خوالێخۆشبوو مەلای قالە دزەیی ناسراوە.

٣٨-ڕەزێک هەبوو بەناوی ڕەزی کاکەی زەرگار پشت مزگەوتی ست خانەبوو پێش١٩٧٠ هەبوو.

٣٩-ڕەزی ئەحمد ئاغای غەفوری لە حەمامۆک جگە لەهەموو ئەوانەی کە باسمانکردن کۆیی یەکان ڕەزیان هەبوو لەچنارۆک، لەکانی ئۆمەراغا لە قور تەلاس لەهیران، لە نازەنین، لە سماقولی گرتک، سێنان، گەری، سوسێ، بایزبەگ، مێکو کاو، کۆیی یەکان لەهاویندا دەچوونە ناو ڕەزەکانیان وەک هەواری هاوینە خەلکی بەولاخ دەچوونە ئەم شوێنانە سەیارە زۆر کەم بوو ڕێگای سەیارە نەبوو لەنێوان شارو گوندەکان ئەم ڕێگایانەی کە ئێستا هەیە لەدوای سالی ١٩٧٦ڕژێمی بەعسی لەناوچوو دروستی کرد بەمەبەستی سەربازی ڕەزەوانەکانی کۆیە سەوزەشیان دەچاند پێداویستی شاریان دابین دەکرد ئێوارانی هاوین خەلکی کۆیە بۆ کات بەڕێکردن دەچوونە ناوشیوی ڕەزان هەنارو هەنجیریان دەکری لەدەرەوەی ڕەزەکان دەیان خوارد زۆرجار مندالی گەرەک دەچوونە ناو ڕەزەکان ڕەزەوانەکان ڕاویان دەنای.

٤٠-ڕەزی خوالێخۆشبوو معرف ئاغا لەجێگایPMF بەداخەوە بەشی زۆری ڕەزەکان کراون بە زەوی نیشتەجێکردن سیمای جوانی شاریان تێکداوە گەر حاجی زیندوبێتەوە دەعواچی دەبێ لەسەر بەرپرسانی ئەم شارە بەڕاستی جاران کۆیە نمونەی جەنەت بوو هۆکاری هەبوونی ئەم هەموو ڕەزو باخە بۆ هەبوونی ڕووبارو کانی و گۆم دێت لەکانی یەکانی ئەم شارە

١-كانی مامه ئەمین نزیک گۆمی کەونه پرد.

٢-کانی کانیله خوار مزگەوتی مەلا ئەسعەد.

٣-کانییەکانی حەمامۆک.

٤-کانی ئاشیله لەکن دائیرەی تاپۆ بوو.

٥-کانی بسکان.

٦-کانی سوراوان پشت گۆرستانی دەروێش خدر.

٧-کانی پشت ماڵی حمدامین حاجی افندی قۆنگرێ.

٨-کانی کونه گورگ نزیک فەرمانگەی بەرگری شارستانی کۆیه خوار شاخی قۆنگر.

٩-کانی برایمه هەتیم دەکەوته بەرامبەر گردی مام جەرجیس

١٠ -کانی یه جلیتی دەکەوته نزیک مزگەووتی ستخانه

١١-کانی یه سەید لەخوار گۆرستانی شەهیدانبوو نزیک قەبری حەمه رەق.

١٢-کانی بن شاخان دەکەوێته دەشتی عەلکەکورمه(دەشتی تەیاره) دامێنی کۆیه سۆفی عەولای شیلەیی باوکی حسن و حوسین سەوزەی لەبەر ئەم کانی یه دەکرد سۆفی عەولا مێردی یا حبیبه بوو دەکاته پلکی جەلال جۆبار.

١٣-کانیه قەره کەدەکەوێته تاتوکان لای چەپی چوارتاقان

ئەم زانیاریانەم له دایکم و خاڵه تۆفیق حاجی تاهیر و کاک هیمداد رەفیق، وەرگرتووه.

جاران رەزەوانەکان گۆمیان هەر دەبەست لەبەهاراندا بۆ کۆکردنەوەی ئاوی رووبار بۆ ئاودانی رەزەکانی کۆیه له هاوینا وەک بەنداوی ئەمرۆ.

١-گـۆمی گەرمـوک جـگە لەمە رۆژانە گەنـج و لاو مەلەیـان تێـدا دەکردو کاتەکانی خۆیان تێدا بەسەر دەبرد.

٢-گۆمی کەونە پرد.

٣-گـۆمی بـن جسـر جـگە لەمـانە دوو گـۆمی دیـکە هەبـوون کە ئاوەرۆیان دەچووە سەرگۆمی کۆنە قەسـاب خـانە پێیان دەگوت گۆمی سەیان بووە بەگەراج، گۆمێکی دیکە هەبوو نـاوی گـۆمی گامێشـان بـوو تەنیشت بلدیەی کۆن ئێستاکراوە بەپارک.



## زنجیرەی پەنجا

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

کە باسی رابردووی کۆیە دەکەی و بەراوردی بکەی بەئەمرۆ گریانت بۆ ئەم شارە شەهید پەروەرە دێت لەبری ئەوەی پێش بکەوێت و بەرەو پێش بچێت، باوەرتان هەبێ لەپەنجاکان گەلێک پێشکەوتووتر بوو کۆیە لەدوای راپەرین رۆژ بەرۆژ بەرەو دواوە دەگەرێتەوە بووە بەقوربانی ململانێ ی دووحیزبی دەسەلاتدار جاران هەندێ دام و دەزگای فەرمی هەبوون ئێستا شوێنەکانیان بە بەتالی و بەوێرانی بە جێماوە یەکێک لەم شوێنانە:

١-دائیرەی تەسویەبوو کاری ئەم فە رمانگەیە تاپۆکردنی زەوی و زاری گوندەکانی دەوری کۆیەی ئەنجام دەدا یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەم فەرمانگەیە خوالێخۆشبوو میرزا حاجی کریم ئاسنگەربوو نەمانی ئەم فەرمانگەیە وای کرد کە زۆربەی گوندەکانی خۆشناوەتی کە سەر بە قەزای کۆیەن تاپۆ نەکرێن بالەخانەی ئەم فەرمانگەیە وێران بووە لەبن گردی قشلەیە تەنیشت یانەی فەرمانبەران.

٢-دار الضیافە واتە میوان خانە بالەخانەکەی لەلایەن بەرپرسەکانی شار روو خێنراو کرا بە خانووی نیشتەجێ کردن ئەم شوێنە رووبەرێکی زۆری زەوی هەبوو نزیکەی ١٢٠٠/م٢ دەبوو هۆلێکی گەورەی تێدابوو بۆ پێشوازی میوان و بەرپرسی گەورەی حکومی باخچەو حەدیقەیەکی گەورەی هەبوو ئەم شوێنە رووی پێشکەوتنی ئەم شارەی پیشان دەدا.

٣-جاران لەم شارە دائیرەی الئیعاشە هەبوو واتە فەرمانگەی ژیاندن ئەم شوێنە لە خانووی مالی جەمیل ئاغای حە وێزی بوو لەخانووە گەورەکەی تەنیشت مزگەوتی کۆنە جومعە دوایی هاتە بەرامبەر مزگەوتی خادم فرنێکی لێ بوو ئێستا کراوە بەدوکان دوایی چووە بالەخانەیەکی حکومی بەرامبەر کۆنە ئینحصار کاری ئەم فەرمانگەیە دابەش کردنی ئاردی نان بوو بۆ هەر نەفەرێک ٨/کغم ئارد

دەدرا مانگانە بەپێ ی دەفتەرێکی فەرمی کە هەموو خانەوادەیەک دەبووهەبیوایە ئەمەش دەفتەری خانەوادەکەی ئێمەبوو بەرپرسی ئەم دائیرە خوالێخۆشبوو کاک عبدالخالق حاجی ئەسعەد چەلەبی بوو بەداخەوە ئەم دائیرە بەوێرانی ماوەتەوە.

٤-جاران لەکۆیە دائیرەی گومرگ هەبوو لە ئیستیلاک بوو لەسەر چایخانەی سمایل عەرەب بەرامبەر منارەی مزگەوتی گەورەبوو پولیسەکان بەجلی مەدەنی دەوامیان دەکرد پێیان دەگوتن قۆرچی کاریان گرتنی داری تەر، رەژوو، توتن بوو ناوی یەکێک لەم قۆرچیانەم لەبیرماوە خوالێخۆشبوو حاجی رەسول ناسراو بوو بە حاجی قۆرچی باپیری کاک صلاح سید عبداللە بوو مالیان لەخوار مالی ئێمەبوو لەگەرەکی بایزاغا.

٥-جاران لەکۆیە ئیستیلاک هەبوو لەم شوێنە تەماتە و ترێ و شوتی و گندۆرەو خەیارو تەرۆزی و سێوو هەرمێ و هەنار مەزاد دەکرا ئەم شوێنە دەکەوێتە بەرامبەر دەرگای مزگەوتی گەورە پێک هاتبوو لە قاعەیەکی گەورە ساحەیەکی فراوانی لە پێش بوو چەند کەسێک سەرپەرشتی ئیستیلاکیان دەکرد.

١-خوالێخۆشبوو صابر عبداللە پەستەک ناسراو بە کاک صابر حەلوا پیاوێکی بەرێز کاری مەزادکردنی ئەم میوەو شتانە بوو کەدەیان هێنا بۆ فرۆشتن خەلکی گوندەکان بەروبوومە کشتوکالیەکانیان بەولاخ دەهێنا لە سێگرتکان، لە ئۆمەر گومبەت، کانیلەلە و تەق تەق، گوندەکانی خۆشناوەتی، وەک سما قولی یەکان، سناوە، جەلی، نازەنین لەناوچەی تەق تەق گندۆرەو شوتی و تەرۆزیان دەهێنا بە ولاخ ئێوارە بارەکانیان لە ئیستیلاک دەخست لە تۆرو تێر دەریان دەهێنا گوێ درێژەکانیان دەبردە خانی گەورە شەو لەلای شوتی و گندۆرەکانیان دەنووستن لەترسی مندالان بەیانی پێش رۆژ هەلات دوکاندار و میوە فرۆش و خەلکی کۆیە لە ئیستیلاک ئامادە دەبوون کاک صابر دەستی دەکرد بەمەزاد دەیگوت مەزاد دوو درهەم سێ درهە م سێ و نیو نەما

زیاد نەما دەیگوت شافل خێر کاتبەکی لەگەڵ بوو ناوی خاوەنی میوەکەو کریارو بری پارەکەی دەنووسی بەم شێوەیە هەموو میوەکانی مەزاد دەکرد.

هەندێک میوە بەقەپان دەکێشرا وەک تەماتە خەیار ئەوەی ناوی دەنووسی لەکاتی مەزاد خوالێخۆشبوو پاشا فتح الله ئاغابوو، خوالێخۆشبوو جعفر پاشا فتح الله ئاغا ئەویش ژمێریاربوو پارەی دەدا بەخاوەن میوەکان.

چەند کەسێکی دیکەش کاریان لەئیستیلاک دەکرد دەگێرنەوە لەساڵەکانی سییەکان مام تەیبی حاجی باپیر کە دەکاتە باوکی حیسام الدین ئەو دامەزرێنەری ئیستیلاک بووە. ئەم بەڕێزانەش کاریان لە ئیستیلاک دەکرد:

١-صلاح سەبع.

٢-خوالێخۆشبوو زاهیر صابر باوکی کاک جاسم.

٣-خوالێخۆشبوو زاهیر حەمکول.

٤-کاک فاتح مجید.

٥-خوالێخۆشبوو کاک وشیار خدر سابیر ئەم شوێنە نەماوە کرا بە دوکانی ئۆرزدی.

٦-فرۆشگای ئۆرزدی هەبوو نەماوە هەموو کەل و پەلێک پێداویستییەکی تێدا دەفرۆشرا لەلایەن حکومەت بەنرخێکی کەمتر لەبازار

٧-لەم شارە هوتێلی باواجی هەبوو هی حکومەت بوو لەگەڵ هوتێلی کۆیە پالاس هوتێلی باواجی کرا دوکان هوتێلی کۆیە پالاس لەبەرامبەر زانکۆ دەستی بەسەر داگیرا لەلایەن بەرپرسانی ئەم شارە ئێستا شاری سە رۆک کۆمار بێ میوانخانەیە.

٨-جگە لەمانەی کە باسمانکردن جاران چالاکی وەرزشی دەکرا وەک پالەوانبازی جاران لەناو قشلە پالەوانبازی دەکرا پالەوانی کۆیە

خوالێخۆشبوو ئیبراهیم حەمە شیرین جگە لەمە شانۆگەری دەکرا تیپی تۆپانێ هەبوو تیپی مۆسیقای باواجی گەرم و گوربوو.
٩-لەکۆیە سینەما هەبووە لەسالی١٩٥١/ ز ئەمریکیەکان سینەمایان لەکۆیە داناوە لەنزیک مزگەوتی خادم سەجادە جگە لەمە لە ١٩٦٧/ز جارێکی دیکە سینەم دانراوە ئێستا نەماوە.
١٠-جاران لە کۆیە کۆمەلەی ئیستهلاکی هەبوو نەماوە ئەم کۆمەلە کەل و پەل و خۆراکی دەفرۆشت بەهەرزان.
١١-جاران تیمێکی تەندروستی هەبوو مالیان دەرشاند بەدەرمانی دی دی تی نەماوە جاران لە وەرتێ و رەواندوزو شەقلاوە دەهاتنە کۆیە بۆ کەل و پەل و پێداویستیەکانیان ئێستا ئەم بازرگانی یە نەماوە کۆیە لەم هەموو پێشکەوتنە بەرەو دواوە دەگەرێتەوە لەسایەی بەرپرسانی دوای راپەرین.
١٢-جاران هەتا پێش راپەرین دائیرەی انحصاری توتن هەبوو ئێستا نەماوە باوەرتان هەبێ باشترین داهات بوو بۆ خەلک و حکومەت ئێستا بەرهەمی توتن نەماوەو ناچێنرێت.
١٣-جگە لەدائیرەی انحصار کارگەی تنقیح واتە پاک کردنەوەی توتن هەبوو باشترین کارگەبوو ئێستا تەنها بالەخانەکەی ماوە بەسەدەها هاولاتی بەهۆی ئەم دائیرە مووچەیان وەردەگرت و بژیوی ژیانی خۆیان پێ دابین دەکرد.
١٤-لە کۆیە باشترین کارگەی مافور دروست کردن و چنین هەبوو ئەویش نەما کەسەدەها کەس هەلی کاریان لەم کارگەیە دەست دەکەوت.
١٥-لەکۆیە کارگەی قەند هەبوو نەما بەکورتی کوردی بەرپرسانی دوای راپەرین شاریان بەرەو لەناو چوون برد هەموو ئەم دەستگایانەی کە سەرچاوەی دەست کەوتنی هەلی کاربوون داخران و لەناو چوون سیمای شاریان کرد بە گوندێکی هاوچەرخ جاران لەکۆتایی پەنجاکان دوای شۆرشی ١٤/٧/ ١٩٥٨ جەماوەری کۆیە بەهەموو چین و

ڕەنگەکـــان خۆپیشـــاندانیان ئەنجـــام دەداو دەرژانە ســەرشـــەقام داوای مافەکانیـــان دەکـرد بـێ ئەوەی بەر پەرچ بـدرێنەوە لە لایەن دەســەلات جوتیار بەخۆی و داسەکەی کرێکار بەخۆی و قازمەکەی بەرگ دروو بەخـۆی و مقەسـەکەی گشـتیان بەجـادە دادەهـاتن بەرەو سـەرای کۆن والله فەلاحەکان بازرگان بەخۆیان و نیو گەزەکەیان برا زۆر سەیر بوو فەلاح داسـی درونەیـان پێ بوو لە جادەی قیر دروونەیـان دەکرد خوا ئاگـادارە لەپـێش خۆپیشـاندەران مامۆسـتای خوالێخۆشـبووی نیشـتمان پەروەر مامۆستا بلال بهاءالدین دەرۆیشت دەیگوت لەسەریان دە کەریم لەسەریان دەمەیان هێلە.

گەل و سـوپای مەزن بەخائینـان مەپارێزە بەراسـتی دیمـوکراتیەت ئەوها دەبێ بۆ خۆشیتان یەکێک لەخۆپێشـاندەرەکان مامۆسـتابوو کـاتی چـاوی بە سـمایل عەرەب کەوت هـاتە نـاوخۆ پێشـاندەرا مامۆسـتاکە هـاواری دەکـرد دەیگـوت سـمایل عەرەب بـۆ دەرەوە بە کەلـک نـایەی پێدەچوو مام سمایل سەربە پارتی بوو چونکە ئەو کات شوعی یەکان خۆپیشاندانیان دەکرد.


الجمهورية العراقية
وزارة المالية
مديرية الاعاشة العامة
هوية لتجهيز طحين


الجمهورية العراقية
PILGRIM PASS جواز سفر الحج والزيارة


الحكومة العراقية
دفتر النفوس
للاناث


مديرية النفوس العامة
للذكور

## زنجیرەی پەنجاویەک

### (پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)

جاران ئەگەر بە بازاری شاری کۆیە گوزەرت بکردبایە هەستت بە جەنجالی بازرگانی و قەرەبالغییەکی زۆر دەکرد چونکە هەر وەک باسمانکرد کۆیە پیشەوەری باشی لێ بوو پێداویستیەکانی ناوچەکەیان دابین دەکرد پێم باشە ناوی دوکاندارەکانی ناو بازارو قەیسەری بە خوێنەری بەرێز ئاشنا بکەم لەسەری مەیدا دەست پێ دەکەین.

١-دوکانی قادری مام حسین پەرەکەر بوو.

٢-دوکانی سۆفی ئاورەحمان لبادچی بوو باوکی حمید لبادچی.

٣-دوکانی کەریمی گولێ لبادچی بوو باوکی کاک جەمال لبادچی.

٤-دوکانی عثمان نانەوا بوو.

٥-دوکانی مام طه گرد گۆرانی بوو باوکی مامۆستا محمد طه وردە وارەی منداڵانی دەفرۆشت لەبن تاقانی سەری مەیدان بوو.

٦-دوکانی مام ئەحمەد سەری مەیدان پینەدۆز بوو.

٧-دوکانی مام خدر پەستەک سۆر برنج و خوێ و سماق و گوێزو مێوژ هتد دەفرۆشت.

٨-دوکانی وەستا عمر کورتان دروو.

٩-دوکانی وەستا عثمان کورتان دروو.

١٠-دوکانی حاجی حسن کورتان دروو.

١١-دوکانی سەعە کۆر چایەچی بوو.

١٢-دوکانی مام حوێز جەلیزادە پەنیرو هەنگوینی دەفرۆشت.

١٣-دوکانی مام عثمان حمد مستەفا کاری چەخماخ سازی دەکرد مامم بوو وەستایەکی بلیمەت بوو.

١٤-دوکانی حاجی عمر مام یەحیا تەنها لێ ی دادەنیشت.

١٥-دوکانی کاک ـ مجید مام عثمان فافۆنی دەفرۆشت کاری چەخماخ سازیشی دەکرد.

١٦-دوکانی کەریمی حاجی حەمە رۆمی ماستی دەفرۆشت.

١٧-دوكـانی مـەولـودی بـرای مەلا خـدری دەرگـای خـانێ وردەوارەی دەفرۆشت

١٨-دوكانی مەلا خدر لە ناو دەرگای خانی گەورە باوكی قادر بەشدار بوو.

١٩-دوكانی مەلای پەرەكەر لەسەر تاقەكەی سەری مە یدان بوو.

٢٠-دوكانی ئەحمەد خمچی كاری رەنگی دەكرد.

٢١-دوكانی كاكە شەل خمچی لەناو دەرگای خانی گەورە.

٢٢-دوكانی وەستا بۆرە چەقوو خەنجەری دروست دەكرد لەكۆلانەكەی بەرامبەر خانی گەورەبوو.

٢٣-چایخانەی مام طە لەكۆلانەی بەرامبەر دەرگای خانی گەورە بوو.

٢٤-دوكانی حەمە سەرسۆر باوكی حاجی رەفیق و شەفیقی نانەوا و علـی سـائق بـوو ئەم چەنـد دوكـانە لەبـن تـاقی سـەری مەیـدان تـا دەرگای خانی گەورەیە.

٢٥-دوكانی عبدالله خەفاف باوكی رزگار كەباب برایان بەم دواییە كاك فایق لەم دوكانە بوو.

٢٦-دوكانی زاهیری سەعدی ئاغا قوماشی دەفرۆشت.

٢٧-دوكانی مام صدیق باوكی نەجیم و یوسف بەقال بوو بەم دواییە وەستا بۆرە لەوێ بوو باوكی محمد بەقال بوو.

٢٨-دوكانی سەید باقلانی بەقال بوو.

٢٩-دوكانی قادر بەگ مستەفا ئەسعە دەسور شەكەرات و وردە والەی دەفرۆشـت چـووە هەولێر لەسـەرەتای ١٩٦٠دوای ئەو حمد حـاجی ئۆمەر هات سەوزەو كەل و پەلی دەفرۆشت.

٣٠-دوكانی مغدید قەساب لەسەر كۆلانەبوو گۆشتی دەفرۆشت.

٣١-دوكانی وەستا رەئوف پەرەكەر دۆشەگ و لێفی دروست دەكرد.

٣٢-چایخانەی عزیز تاهیر حەبۆر.

٣٣-دوكانی خدری سۆفی محمد قەساب گۆشت فرۆش بوو.

٣٤-دوكانی خەزایی بەقال بوو.

٣٥-دوكـــانی مـــام تەیـــار گـــۆج بـــاخچەوان ســـەوزەی دەفرۆشـــت لێرەوە بەرەو گوزەری کورتان دەرۆین.
٣٦-دوکانی وەستا رسول عەدیلان پینەدۆز بوو.
٣٧-دوکانی کاک عبداللە مام یەحیا بەفرو شەربەتیان دەفرۆشت کاک میرزاو کاک دلشاد لە گەلی کاریان دەکرد بەم دوایی یە بوو بەهی عمر سەردۆلی قوماشی دەفرۆشت.
٣٨-دوکانی وەستا قادر کەبابچی باوکی کاک اکرم.
٣٩-دوکای مام عبداللە تۆفیق باوکی کاک پۆلا و مامۆستا نامق بەقال بوو.
٤٠-دوکانی رسول کەبابچی باوکی کاک فاتح رسول.
٤١-دوکانی حمد حاجی خەلیفە باخچەوان بوو سەوزەی دەفرۆشت.
٤٢-دوکانی سید حسین عەتاری و دەرمانی شەعبی دەفرۆشت.
٤٣-دوکـانی مسـتەفا ئـە سـعەدە سـور عەتـاری و دەرمـانی شـەعبی دەفرۆشت.
٤٤-دوکانی وەستا حمدامین وەستا سالح کەبابچی لەگەل کاک عبداللە و کاک خالد کە بابچی بوون.
٤٥-دوکـــانی کـــاک فـــایق مـــام ســـالح بەقـــال و عەتـــار و سەوزەشـــی دەفرۆشت.
٤٦-دوکان مام سابیری چایەچی برای مام حەمەشین.
٤٧-دوکانی وەستا عمر بە قال بوو سەوزەشی دەفرۆشت.
٤٨-دوکانی کاک عبداللە باوکی مامۆستا احمد عەتاربوو ئەم دوکانەی دوای خانەنشینی دانا.
٤٩-وەستا محمد پینەدۆز باوکی کاک رەفیق و شەهید دلشاد.
٥٠-دوکـــانی کـــاک عەزاو حەســیرو چەرچەف و بـــالیف و اســـفنجی دەفرۆشت. دوای وازهێنانی لەپیشەی کورتان دروون.
٥١-دوکـانی جەلالە شـەلی سـماقولی گەری تاسـەر کـۆلانەی گـوزەری کورتان درووان.

ئێستا دەچینە ناو گوزەری کورتان درووان:

٥٢-دوکانی وەستا عبداللەی کورتان دروو لەگەل کورەکانی کاری دەکرد کاک حاجی کاک قوباد کاک فەتاح.

٥٣-دوکانی وەستا حمدامین کورتان دروو لەگەل وەستا بەکرو وەستا عەزاو کاریان دەکرد.

٥٤-وەستا حسن و کورەکانی وەستا جلال وەستا خالد وەستا کەمال وەستا امیر وەستا دلزار. لەم گوزەرە چەند مالێک هەبوون مالی مەلا علی حاجی توفیق مالی جلال جۆبار مالی کاکە بەگ باوکی حسن بەگ.

٥٥-خانی وەستا عوسمانی نالبەند.

٥٦-چایخانەی عبداللە مەلافتح اللە مەلا عەباس.

٥٧-وەستا محمودی ئەسعەدە سور سەرتاش بوو.

ئێستا لەسەر کۆلانی گوزەری کورتان دەرۆین بەرەو جادەی مزگەوتی گەورەو چێشتخانەی رینگە:

٥٨-دوکانی مام حەمە علی شەلە باوکی مامە جاف بەقال بوو.

٥٩-دوکانی ملا نافع جەلیزادە فافۆنی دەفرۆشت.

٦٠-دوکانی وەستا رفیق سراج کاری سەراجی دەکرد.

٦١-دوکانی مام فتح اللە اغا باوکی کاک جوهر.

٦٢-دوکانی وەستا فتاح مام حمدأمین پینە دۆزی دەکرد، لەژیاندامارە.

٦٣-دوکانی جلال جۆبار هەموو کەل و پەلێکی دەفرۆشت.

٦٤-دوکانی کاک قادر برای وەستا حەمە علی سەرتاش.

٦٥-دوکانی سید جلال سید قادر.

٦٦-دوکان کاک حمید حاجی صالح.

٦٧-دوکانی مەولود مام قلینجی لەروکنەکە بوو دوای ئەوبوو بەهی رشید مام یەحیا سەوزەی دفرۆشت.

٦٨ -دوکانی کەریم فەقێیانی برای حسن فەقێیانی.

٦٩-دوکانی دلشاد عبدالله مام یەحیا شەکرو چاوبرنج و کەرستەی
خواردنی دەفرۆشت.
٧٠-دوکانی حمید مامز شەکرو چاو رون وکەرستە خواردنی
دەفرۆشت.
٧١-چایخانەی مەهدی چایەچی بەم دواییە بوو بەهی رسول مەزن
کاری چایەچی لێدەکرد.
٧٢-دوکانی وەستا مستەفای سەری مەیدان سەوزەی دەفرۆشت.
٧٣-دوکانی کاک حەمە برای صدیق چایەچی بە قال بوو.
٧٤-دوکانی وەستا نصرالله چەخماخ سازبوو.
٧٥-دوکانی مەلای مەلا حمید شەکرو چاو روون و کەرەستەی دیکەی
دەفرۆشت لەگەل سەوزە.
٧٦-دوکانی مام کریم باوکی حەکیم و محمد سەوزەی دەفرۆشت.
٧٧-دوکانی وەستا سەید سلام پینە دۆزی دەکرد برای سەید بەکر.
ئێستا لەلای دوکانی جلال جۆبار بەرەو ناو بازاری گەورە.
٧٨-دوکانی حەمە طیب مام رەزا عەتاری و وردەوالەی دەفرۆشت.
٧٩-دوکانی مەلا رەئوف جەلیزادە باوکی کاک سابیر سەوزەی
دەفرۆشت بەم دوایی یە بوو بەهی حاجی عبداللەی سناوەیی.
٨٠-چایخانەی مام سمایل باوکی دلشاد.
٨١-نانەواخانەی وەستا سەلام و کاکە مەم.
٨٢-کەبابخانەی مام اسماعیل دێوە.
٨٣-دوکانی تاهیر سەراج کاری سەراجی دەکرد.
٨٤-دوکانی وەستا مستەفای نانەوا ئەستوکی دروست دەکرد.
٨٥-دوکانی جلال عەبدە فەقێ عصمت پێلاوو کەل و پەل و عەتاری
دەفرۆشت.
٨٦-دوکانی مام باپیرە شەل پێلاوو کەل و پەل و عەتاری دەفرۆشت
٨٧-دوکانی مەلا کەریم باوکی کاک تۆفیق و جەبار وردە والەو فافۆن
وکەرستەی کرێکاری دەفرۆشت.
٨٨-دوکانی سەید حەسەن سەیدی کرۆژ بوو قوماشی دەفرۆشت.

٨٩-دوکانی یاکافیەی ناسرابوو بە یاکافیەی مەلایان میوەو سەوزەی دەفرۆشت زۆر بە شەخسیەت بوو.
٩٠-دوکانی مەلا تەهای لەگەل محمدی کوری ئەستوکە بەروونیان دەکرد.
٩١-دوکانی حەمە چاورەش ماست و سەو زەو وردەواله ی دەفرۆشت.
٩٢-دوکانی فەقێ عوسمان و حەمە تایەر قەساب گۆشتیان دەفرۆشت.
٩٣-دوکانی کەیفی عبدالرحمن نەشئەت کوتالی دەفرۆشت.
٩٤-دوکانی مام صالح کێشکەیی کوتالی دەفرۆشت.
٩٥-دوکانی وەستا سادق کالەک دروو.
٩٦-دوکانی عمر حمید قەساب وردە والەی دەفرۆشت.
٩٧-دوکانی حەمە سور مام وسو مەنگور عەتاری و وردە والەی دەفرۆشت.
٩٨-دوکانی سۆفی نەشئەت قوماشی موبرەتی کلاوانی دەفرۆشت لەگەل دەرمانی شەعبی.
٩٩-چایخانەی صدیقی چایەچی قونەبانی چایخانەکە لەسەربانی قەیسەری بوو دوو کۆسپە لەم بەرو ئەوبەری کۆلانە باریکە کەبوو یەکێکیان.
١٠٠-وەستا کەریم پینە دۆزی لێدەکرد ئەم پیاوە بانگ دەربوو لە مزگەوتی گەورە دوای ئەو وەستا محمد عمر پینە دۆزی لێدەکرد باوکی کامل و شامل.
١٠١-لەسەر کۆسپەی دووەم کە بەرامبەر یەک بوون عارف بەکری عەودالان شەربەتی لێ دەفرۆشت باوکی کاک باپیرو جەلال.

ئێستا دەچینە ناو بازارو قەیسەریەکان:

١٠٢-دوکانی نجیم طاهر چەلەبی قوماش فرۆش بوو کورەکەی نەجدەت لەگەڵی بوو.

١٠٣-دوكانى كاكه بەگ ئەسعەده سور باوكى حسن بەگ عەتارى و ورده والەى دەفرۆشت.
١٠٤-دوكانى سيد عبدالله ماليان لەگردى بوو باوكى مامۆستا خالد و مغديد كورەكى لەبانى مزگەوتى گردى بەربۆوەو مرد قوماشى دەفرۆشت.
١٠٥-دوكانى حاجى كەريمه رەش براى طاهر چلبى هەر دادەنيشت هيچى نه دەفرۆشت كەواو چاكەتى لەبەر بوو.
١٠٦-دوكانى كاك رەفعەت ظاهر چلبى قوماش فرۆش بوو.
١٠٧-دوكانى وەستا رشيد پينەدۆز باوكى وەستا عبدالله فيتەر.
١٠٨-دوكانى سەيد عبدالله سيد سمايل ناسراو بەسەيد عبدالله پول فرۆش قوماش فرۆش بوو.
١٠٩-دوكانى بەرگدروو فتاح مەلا عەبد.
١١٠-دوكانى حاجى فتاح كريم ورده واله و شەكرو چاو پێداويستى ناو مالى دەفرۆشت.
١١١-دوكانى مەلا مەجيد مفتى عەتارى دەفرۆشت.
١١٢-دوكانى حاجى على قەلادزەيى قوماشى دەفرۆشت.
١١٣-دوكانى باوكم عمر حمد دباغ قوماش فرۆش بوو.
١١٤-دوكانى ميرزا عەجەم ئيرانى بوو قوماشى دەفرۆشت دواى ئەو حوێز حاجى ئەحمەد هاته شوێنەكەى قوماشى دەفرۆشت.
١١٥-دوكانى خدره سور قوماشى دەفرۆشت.
١١٦-دوكانى حمد بەگ قادر چاوشين گوێزو هەنگوينى دەفرۆشت.
١١٧-دوكانى حاجى عەولاى خەنجەرچى قوماش فرۆش بوو.
١١٨-دوكانى بەرگ دروو سابير مام طاهر.
١١٩-دوكانى شفيق عبدالرحمن نەشئەت بەرگ دروو بوو.
١٢٠-دوكانى عزيز قادر رەواندزى لەسەرەتا لەناو قەيسەرى كۆن بوو لێفەو دۆشەگيان دەفرۆشت كارى بەرگ دروونيشيان دەكرد بەم دوايه هاته ناوبازار قوماشى دەفرۆشت.

١٢١-دوكانی احسان مام عثمان عەتاری و داوی مەكینەو كەرستەی بەرگ دروونی دەفرۆشت جار جار كاری چەخماخ سازی دەكرد پیشەوەرێكی باش بوو.
١٢٢-دوكانی وەستا ئەكرەم عمر بەرگدرووەكی بێ وێنەبوو.
١٢٣-دوكانی جەمال مام وهاب عەتاروو دەرمانی شەعبی دەفرۆشت.
١٢٤-دوكانی حاجی عبدالله وردەوالەی دەفرۆشت.
١٢٥-دوكانی جەمال حاجی صدیق قوماشی دەفرۆشت.
١٢٦-دوكانی محمد حاجی مستەفا قوماشی دەفرۆشت.
١٢٧-دوكانی حاجی صدیق عەولا قوماش فرۆش بوو.
١٢٨-دوكانی حاجی رەحمان حاجی ئەحمەد عەتاری دەفرۆشت
١٢٩-دوكانی مامە ئەمین لەگەل زاهیرە گچكەل و مەغدیدە گچكەل پینە دۆزیان دەكرد لەپێش دەرگای قەیسەری نوێ.
١٣٠-دوكانی حاجی حەمە علی باوكی مامۆستا عبدالخالق وردە والە و عەتاری دەفرۆشت.
١٣١-دوكانی بەرگ دروو مجید فەقێ عەولا.
١٣٢-دوكانی فتاح فەقێ عەولا بایع بوو.
١٣٣-دوكانی عمر حاجی محمد قوماش فرۆش بوو.
١٣٤-دوكانی تایەر حەمە دەرزی قوماش فرۆش بوو.
١٣٥-دوكانی بەرگ دروو صباح مام حسین، ناسراوە بە قۆزە.
١٣٦-دوكانی قادر حاجی ئەحمەد قوماش فرۆش بوو.
١٣٧-دوكانی وەستا محی الدین قەبر هەلكەن بەرگ دروو بوون لەگەل حاجی تایەرو صدیقی كوری.
١٣٨-دوكانی فتح الله بۆیاغچی پینەدۆزو قۆندەرەشی بۆیاغ دەكرد.
١٣٩-دوكانی وەستا حەمەدی خەنجەركەر.
١٤٠-دوكانی وەستا عەبدەی خەنجەركەر لەگەل كاك رەفیق كاری خەنجەریان دەكرد.

١٤١-وەستارەفیق حمد مەیتەر چایەچی بوو بەم دوایی یە کردیە تسجیلات دوایی کورەکەی کاک نەوزاد کردیەوە تۆمارگا.
١٤٢-دوکانی ئازاد رفیق مەیتەر کمالیات و جوانکاری دەفرۆشت.
١٤٣-دوکانی کاک صمد مەلا کەریم قوماشی دەفرۆشت.
١٤٤-دوکانی ئەحمەد خدر بەرەو مافورو حەسیری دەفرۆشت باوکی شەهید سەرباز.
١٤٥-دوکانی بەکری حمدی خەنجەرکەر پێلاوی دەفرۆشت.
١٤٦-دوکانی مام تەهای پەنیر فرۆش مام هەمزەش شەریکی بوو.
١٤٧-دوکانی بەکر سۆفی محمد قەساب جوانکاری دەفرۆشت.
١٤٨-دوکانی صابر سۆفی محمد قەساب گۆشت فرۆش بوو.
١٤٩-دوکانی حەمە غەریب قەلادزەیی باوکی دکتور مشیرو کاک ئەمیر بەقال بوو.
١٥٠-دوکانی کاوەیس کەبابچی.
١٥١-دوکانی عبدالله مام عبدالرحمن شەربەتی مێوژی دەفرۆشت.
١٥٢-دوکانی وەستا حمدأمین پینەدۆز.
١٥٣-دوکانی سلیمانی ئاسنگەر ئاسنگەر بوو.
١٥٤-دوکانی باقی مام عبدالرحمن پەنیرو ماستی دەفرۆشت.
١٥٥-دوکانی حەمەد یەمەنی درووی عەتاری دەفرۆشت.
١٥٦-دوکانی حاجی عبداللەی بەربەر باوکی وەستا بەکر و کاک عمر.
١٥٧-دوکانی عزیز ئاغای باوکی محسن ئاغا تەنها لێ ی دادەنیشت.
١٥٨-دوکانی کاکە افندی سەرتاش.
١٥٩-دوکانی وەستا حەمە عەلی سەرتاش.
١٦٠-دوکانی محمدابوبکر جگەرچی.
١٦١-دوکانی حاجی زرار بایع بوو شەکرو چای دەهێنا.
بەرەو گوزەری نەجاران.
١٦٢-دوکانی وەستا معروف کا مەلا سەرتاشبوو.
١٦٣-دوکانی زاهیر مەلا رەئوف چایەچی بوو.

١٦٤-دوكانی كەمال حمد بەگ دارتاش بوو.
١٦٥-دوكانی سەعيد عبدالله دارتاش بوو.
١٦٦-دوكانی وەستا عمر كەريم فرياد و فەرەيدون كاری دارتاشيان لەگەل دەكرد.
١٦٧-دوكانی وەستا سورە كاك نەوزاد لەگەلی كاری دەكرد.
١٦٨-دوكانی وەستا سمايل كاك محمدی كوری يارمەتی دەدا لەكاری دارتاشی.
١٦٩-دوكانی وەستا حسين شوێنی بازرگانی بوو.
١٧٠-دوكانی اسماعيل وەستا مستەفا نالبەند كاری چاككردنەوەی مەكينەی دروومانی دەكرد.
١٧١-دوكانی كريم شاناز سەوزەی دەفرۆشت.

رووله كتێبخانەی كۆن
١٧٢-دوكانی محمد حاجی سمايل پێلاوی دەفرۆشت.
١٧٣-دوكانی سيدعبدالله قوماش فرۆش.
١٧٤-دوكانی خدرە سور قوماش فرۆش.
١٧٥-دوكانی نافيز سەعاتچی.
١٧٦-دوكانی حميد خيابان قوماش فرۆش دوای ئەوبوو بەدوكانی كريم رسول كەبابچی.
١٧٧-دوكانی حوێز مام يەحيا لەشوێن كەباب برايان.
١٧٨-دوكانی واحد ئاشەوان وەختێک بوو بەچێشتخانە دوايی بوو بە دوكانی ميوە فرۆشتن.
١٧٩-چايخانەی سورەی عەبد ئاغا ساحەبوو باخچەيەكی تێدابوو.
١٨٠-دوكانی كاك عثمان عەونی شوێنی بازرگانی بوو.
١٨١-دوكانی اسماعيل مەلا نوری شوێنی بازرگانی بوو.
١٨٢-دوكانی حاجی عبدالله حەمە زێ زێ ی دۆندرمە فرۆش يا ترشی فرۆش.
١٨٣-دوكانی فتاح فەقێ يانی شوێنی بازرگانی بوو.

١٨٤-دوكانی صالح كافرۆشی بازرگانی دەكرد.
١٨٥-سەعید حەمە قاوەچی سەعاتچی بوو كاك كاوە كاروان كاریان لەگەل دەكرد.

دەچینەوە ناو بازار لای خانی قادر یاسین:
١٨٦-دوكانی پاشای عمر عەواش بازرگانی شەكرو چابوو.
١٨٧-چایخانەی شەهید سلێمان حەمە قاوەچی.
١٨٨-دوكانی سەعید ابوبكر قەساب كورەكانی جەنگی و فریاد كاری قەسابیان لەگەل دەكرد.
١٨٩-دوكانی مام حمدأمین باوكی وریا بە قال بوو ماست و سەوزەی گوندی عەو دالانی دەفرۆشت.
١٩٠-دوكانی خارە حمید سەوزەی دەفرۆشت.
١٩١-دوكانی وەستا عەبدەی ئاسنگەر ئاسنگەر نوو.
١٩٢-وەستا بەكری پینەدۆز.
١٩٣-دوكانی مام تۆفیق یاسین بەقال بوو.
١٩٤-دوكانی رسول ئاغا وردەوالەی دەفرۆشت.
١٩٥-خانی قادری یاسین كاروان سەرابوو.
١٩٦-دوكانی وەستا علی مام خدر بەرگ دروو بوو.
١٩٧-دوكان كاك انور بە قال بوو.
١٩٧-دوكانی عادل ئاغا وردەوالەی دەفرۆشت.
١٩٨-دوكانی مام عبدالرحمن ناسراو بە (مام ئاورەحمان)بەقال بوو.
١٩٩-دوكانی خدر احمد ناسراو بە خدر سێ سونی وردەوالەی دەفرۆشت.
٢٠٠-دوكانی حەوێز قازانج بەقال بوو.
٢٠١-دوكانی بەكر سوفی محمد قەساب جوانكاری دەفرۆشت.
٢٠٢-مستەفا سۆفی قادر چایەچی.
٢٠٣-دوكانی مەلا زادە قوماش فرۆش.

٢٠٤-دوكانی فیسەل تاهیر چەلەبی قوماش فرۆش.
٢٠٥-دوكانی كریم حاجی حەمەزێ شەكرو چاو وردەواڵەی دەفرۆشت.
٢٠٦-دوكانی حاجی سمایل قاله هەینی شەكرو چای بەجمله دەفرۆشت.
٢٠٧-دوكانی حەمە سۆیتەر بەقال.
٢٠٨-دوكانی ئەحمەد شینه بەقال بوو سەوزەی دەفرۆشت.
٢٠٩-دوكانی حمید صالح بەقال بوو كاری قەپانی دەكرد.
٢١٠-دوكانی صمد لبادچی.
٢١١-دوكانی فتاح چایەچی ناسراوه بەفتاحی نانەوا.
٢١٢-دوكانی عبدالرزاق قادر یاسین وردەوالەی دەفرۆشت.
٢١٣-دوكانی شوكر مام فتحی بەرگ دروو بوو.
٢١٤-دوكانی حاجی سلێمان حاجی عبدالرحیم كوتال فرۆش بوو.
٢١٥-دوكانی شادمان جمال بەرگدروو.
٢١٦-دوكانی حاجی رەزا مام عثمان كوتال فرۆش بوو.
٢١٧-دوكانی قادر حسین ناسراو به قادر اغا چایەچی بوو دوای ئەو كاك مەمەند طه بوو به چایەچی دوای ئەویش كاك مەهدی بوو به چایەچی.
٢١٨-دوكانی عبدالخالق نەجیم چەلەبی لەقەیسەری نوێ.
٢١٩-دوكانی حاجی جلال له قەیسەری نوێ.
٢٢٠-دوكانی حاجی كریم حاجی علی قوماش فرۆش بوو.
٢٢١-دوكانی حمدأمین حاجی افندی تەنها بۆ دانیشتن بوو.
٢٢٢-مام رەشاد بەرگدروو بوو.
٢٢٣-وەستا عبدالرحمن بەرگدروو بوو.
٢٢٤-دوكانی حاجی جەمال باوكی كاك سەربەست قوماش فرۆش بوو.
٢٢٥-چایخانەی عزیز تاهیر حەبۆر.
٢٢٦-بەرگدروو جلال حمد بەگ.
٢٢٧-دوكانی حاجی كریم ئاسنگەر تەنها بۆ دانیشتن بوو.
٢٢٨-دوكانی حاجی واحد حاجی مستەفا چەلەبی قوماش فرۆش.

٢٢٩-مام سابیر سۆل درووو بوو.
٢٣٠-فەقێ برایم یەمەنی درووو.
٢٣١-قادر رەواندزی و کاک عزیزی کوری قەیسەری کەون لێف و دۆشەگیان دەفرۆشت کاری بەرگدروونیشیان دەکرد.
٢٣٢-بەرگدروو کاک رەفیق بهاءالدین.
٢٣٣-دوکانی حاجی امین سکتانی قوماش فرۆشی جملە بوو.
٢٣٤-دوکانی مستەفا حاجی قارەمان بەرگدروو بوو کورەجەی دەدووری.
٢٣٥-عەبدە حاجی قارەمان بەرگدروو بوو.
٢٣٦-حاجی سەعید حاجی احمد کوتال فرۆشی جملەبوو.
٢٣٧-مام عبدالله باوکی کاک عزیز بەرگدروو.
٢٣٨-حاجی عمر حاجی احمد کورەجەی دەدوری.
٢٣٩-عبدالرحمن فەقێ عەولا کورەجەی دەدوری.
٢٤٠-حمدامین بەگ کورەجەو سەلتەی دەدووری.

ئێستا دەچینە دوکانەکانی تەنیشت کتێبخانەی کۆن:
٢٤١-وەستا اکرم خەیات.
٢٤٢-حاجی واحد حاجی مستەفا کوتال فرۆش.
٢٤٣-دوکانی احمد بەگ کوتال فرۆش بەم دواییە کورەکەی اکرم کردویەتی بەکتێبخانە.
٢٤٤-دوکانی محمد عمر دەباغ کوتال فرۆش دوایی بوو بەهی محمد حەیدەری کرا بەدەرمانخانە.
٢٤٥-دوکانی سەرتاش امیرفتح الله دوایی بوو بەهی زریان سەرتاش دوای ئەوبوو بەهی شێرە حوێز سەرتاش.
٢٤٦-دوکانی نەریمان.
٢٤٧-وەستا محمود دارتاش.
٢٤٨-وەستا حمدامین مەلا صابر تەلەفزیۆنی چاک دەکردەوە.

٢٤٩-دوکانی واحد حەمە شەل وردە ووالەی دەفرۆشت.
٢٥٠-دوکانی تاهیر عزیز دەرمانخانەبوو.
٢٥١-عبدالرحمن کورە دەرمانخانەبوو.
٢٥٢-عمر چایەچی.
٢٥٣-سمایل جگەرە فرۆش.
٢٥٤-اسماعیل عەولا عزەت جوانکاری دەفرۆشت دوایی بوو بەهی کەمال سەردۆلی.
٢٥٥-دوکانی کەیفی حاجی سمایل کەل و پەلی سەیارەی دەفرۆشت
٢٥٦-چایخانەی حەمە گەمحان.
٢٥٧-دوکانی حاجی رەزا توتن فرۆش.
٢٥٨-دوکانی حەمەی عەولا جەیدی کاری بۆری و کلیل سازی دەکرد.
٢٥٩-کەریم حەمە شەل شەربەت فرۆش.
٢٦٠-دوکانی کاکە حەمە میوەی دەفرۆشت.
٢٦١-کاک سلیمان حەمە سەعید شەربەتی دەفرۆشت دوایی بوو بە وەکیلی پاکەت.
٢٦٢-دوکانی سەید سمایل سید قادر شەکەرات وردەوالەی دەفرۆشت

ئێستا بەرەو فولکەی حاجی قادر دەرۆین:
٢٦٣-دوکانی علی یارابی وێنەگری چنارۆک بوو.
٢٦٤-دوکانی میرزا عبدالله وەکیلی شەریکەی ئەفریقی.
٢٦٥-دوکانی وەستا تحسین پینەدۆزبوو.
٢٦٦-چایخانەی ئافە برای تاهیر تۆفیق.
٢٦٧-دوکانی کەریم سەلیم کەرستەی وەک چەکوش و مشارو پلایس هتد دەفرۆشت.
٢٦٨-دوکانی وەستا بەکر سەرتاش.
٢٦٩-دوکانی سلیمان حەمە سەعید بوو بە وەکیلی جگەرە.
٢٧٠-دوکانی کاک محمد سکتانی وەکیلی شەریکەی ئەفریقی بوو.
٢٧١-دوکانی وەستا محمد حاجی صابر نانەوای ئەستوک بوو.

٢٧٢-وەستا سەلامی نانەوا.
٢٧٣-دوکانی حوێزی مطعمچی.
٢٧٤-دوکانی دارتاش احمد علی گچکەل دارتاش.
٢٧٥-دوکانی مەلاجواد هەموو کەل و پەل و خواردنێکی دەفرۆشت.
٢٧٦-دوکانی ئەحمەد خان عەتاری و کەل و پەل.
٢٧٧-عبدالرزاق عەدیلان میوەی دەفرۆشت لەگەل بەفر.
٢٧٨-دوکان سەلام سەوزەی دەفرۆشت.
٢٧٩-دوکانی غەفور سەوزەی دەفرۆشت.
٢٨٠-دوکانی یا نەزیف هەموو شتێکی هەبوو.
٢٨١-دوکانی حەسەن وردە وارە برای مەلای مضمدبوو.
٢٨٢-دوکانی فتاح حکیم کوتال فرۆش بوو.
٢٨٣-دوکانی یا ئامینە سەوزە فرۆش بوو.
٢٨٤-دوکانی عبدالرحمن طە قرطاسیەی دەفرۆشت.
٢٨٥-دوکانی انور عمر قرطاسیەی دەفرۆشت.
٢٨٦-دوکانی مستەفای مەلا کورسی و مێزی دەفرۆشت.
٢٨٧-دوکانی کاک عبداللە پایسکلی بەکرێ دەدا بۆ منداڵان.
٢٨٨-دوکانی صباح نانەوا.
٢٨٩-دوکانی مەلا عمر نازەنینی بەقال بوو.
٢٨٩-چایخانەی فتاح حکیم دوایی بوو بەهی کریم سلیم.
٢٩٠-دوکانی فاضل حلاق.
٢٩١-دوکانی رشید قادر چایەچی.
٢٩٢-دوکانی سید عزیز سەوزەی دەفرۆشت.
٢٩٣-دوکانی عمر رسول پاراغ بەقال بوو.

ئێستا باسی دوکانەکانی لای بانک بەرەو خوار:

٢٩٤-دوکانی مغدید مولود زێرنگر دوایی بوو بەهی عبدالرزاق زێرنگر دوای ئەوبوو بەهی مستەفا عەرەب.

٢٩٥-دوكانی صمد مام تۆفیق کوتال فرۆش بوو.
٢٩٦-دوكانی رشید بەعسی کوتال فرۆش بوو، بۆیە پێیان دەگوت (رەشید بەعسی) چونکە بەعسییەکان زۆر ئەشکەنجەیان دا.
٢٩٧-دوكانی رەفیق عبدالله کوتال فرۆش بوو.
٢٩٨-دوكانی کاک عزیز عبدالله بەرگ دروو.
٢٩٩-دوكانی ئەبرەها دیان بەرگ دروو.
٣٠٠-دوكانی کریم فەقێیانی کوتال فرۆش.
٣٠١-چایخانەی بەگە.
٣٠٢-دوكانی مامە عەدە بەقال بوو دوایی بوو بەهی کەمالی کوری.
٣٠٣-دوكانی حەمە سور.
٣٠٤-چایخانەی ئۆمەری چایەچی.
٣٠٥-دوكانی سمایل حەسور علاف.
٣٠٦-دوكانی حاجی قادر علاف.
٣٠٧-دوكانی وەستا عمر ئاسنگەر سەوزەی دەفرۆشت.
٣٠٨-دوكانی رفیق حەمە عەلی برای مامە جاف سەوزەی دەفرۆشت.
٣٠٩-دوكانی عبدالله نەجار.
٣١٠-کەمالی زێرنگەر.
٣١٠-دوكانی حوێز نالە عەجەم.
٣١١-دوكانی تۆفیق حمد مەیتەر عەتاری و کەل و پەلی دەفرۆشت.
٣١٢-جەمال مام یەحیا سەوزەی دەفرۆشت.
٣١٣-سلیمان قەساب.
٣١٤-شەفیق نانەوا.
٣١٥-دوكانی سەرتیپ محمود فەقێ قەساب.
٣١٦-دوكانی محمد عمر باوکی کامل و شامل.
٣١٧-دوكانی سید برایم سید سەعیدلەناو بازار قوماشی دەفرۆشت.
٣١٨-عمر حاجی حسن سکتانی بە رگ دروو.
٣١٩-مەجید حاجی عمر بەرگ دروو.

٣٢٠-دوکانی سلیمان حاجی قادر بایع بوو.
٣٢٣-ستۆدیۆی محمد مەهدی.
٣٢٤-دوکانی اکرم مەنسور تایەی دەفرۆشت.
٣٢٥-دوکانی سلیمان نەجار تایەی دەفرۆشت.
٣٢٦-دوکانی سمکۆ ئوتیچی.
٣٢٧-دوکانی کمال مام وهاب جگەرە فرۆش.
٣٢٨-دوکانی دلشا کریم ئاسنگەر بەفری دەفرۆشت.
٣٢٩-دوکانی کاکە ئاغا بۆ دانیشتن دوایی بوو بەهی سیدوەلی.
٣٣٠-دوکانی محمد حمدأمین پینە دۆز.
٣٣١-دوکانی خدر سمایلە خرە قوماشی دەفرۆشت.
٣٣٢-دوکانی ابراهیم وەستا حسن قوماش فرۆش بوو.
٣٣٣-دوکانی مغدید شیلەیی بەقال بوو سەوزەی دەفرۆشت.
٣٣٤-دوکانی قادر یارابی شەربەتی دەفرۆشت بەم دوایی یە بوو بەبایع.
٣٣٥-مام سمایل صالح بە قال بەرامبەر دەرگای مزگەوتی گەورە.
٣٣٦-دوکانی مەلا سمایلی گردی قوماشی دەفرۆشت لەمەیدانی خوارێ.
٣٣٧-دوکانی رسول ئاغا باوکی مامۆستا عمر بەقال بوو.
٣٣٨-چایخانەی بەکر اغای حەمە صدیق لەمەیدانی خوارێ بوو.
٣٣٩-دوکانی سمکۆ برای کیخوا مەمەند عەلاف بوو.
٣٤٠-دوکانی باقی مام سالح سەرتاش بوو.
٣٤١-دوکانی جەمال حلاق.
٣٤٢-دوکانی جەمیل فەقێیانی پێلاوی دەفرۆشت.
٣٤٣-دوکانی واحد چەکمەرەق بایەع بوو.
٤٤-دوکانی فەقێ احمد کوردەبەقال بوو.
٣٤٥-دوکانی حەسەن علی یە ئەفەندی نانەوا.
٣٤٦-دوکانی فەقێ سەلیم بەقال بوو.
٣٤٧-دوکانی نەریمان کاکە خەیات تۆمارگا بوو.

٣٤٨-دوكانى ئەكرەم قادر حەيدەرى جوانكارى هەبوو.
٣٤٩-دوكانى كاكە شەل خمچى جگە لەكارەكەى خۆى قەفەزى كەوى دروست دەكرد.
٣٥٠-دوكانى تالب سەيد على خەتات.
٣٥١-دوكانى ئەسوەد حاجى فتاح خەتات.
٣٥٢-دوكانى سەيد على نەجار.
٣٥٣-دوكانى ئەحمەد خدر بۆ كەل وپەلى كارەباى.
٣٥٤-دوكانى وەستا عمر مەلاواحيد نەجار.
٣٥٥-دوكانى سەلاح عەبدە خرەبۆ كارەباى.
٣٥٦-دوكانى عمرفەقى احمد كوردە سەوزە فرۆش.
٣٥٧-دوكانى كەمال اسماعيل خەيات.
٣٥٨-دوكانى كەمال ئەمين سەمەنێ عەتار.
٣٥٩-دوكانى رەفيق ئەمين سەمەنێ لەبازارە گچكەلەى.
٣٦٠-دوكانى فوئادى حاجى عەبدول رەحيم.
٣٦١-دوكانى وەستا عمر نەجار عەودالآنى.
٣٦٢-دوكانى وەستا رەئوف سەراج.
٣٦٣-دوكانى سمايل نازەنينى بەقال.
٣٦٤-دوكانى عبدالله تايەر لەبازارە گچكەلە.
٣٦٥-دوكانى حمدامين جگەرە فرۆش.
٣٦٦-دوكانى قادر جگەرە فرۆش.
٣٦٧-دوكانى كاكە امين سەوزە فرۆش.
٣٦٨-دوكانى حاجى حسێن باوكى قادر و حميد چايەچى و مامۆستا جەمال.
٣٦٩-دوكانى سەيد حسێن عەتارى و دەرمانى كوردەوارى دەفرۆشت.
٣٧٠-دوكانى خدر سمايلە خڕە كوتالى دەفرۆشت.
٣٧١-دوكانى ابراهيم وەستا حسن كوتالى دەفرۆشت بەرامبەر چێشتخانەى ڕينگە.

٣٧٢-چایخانەی حمدامین عباس لەتەنیشت كۆنە مەكتەبەی بوو.
٣٧٣ -دووكانی حەمەعەلی لە ناوەراستی گردی جولەكان بوو وردەوارەو سەوزەی دەفرۆشت.
٣٧٤ -دوكانی حاجی برایم برای حاجی رەزای توتن فرۆش كاری توتن و هەنگوینی دەكرد.
٣٧٥-دوكانی قادر اغای عبد اغای سەوزەو ماستی دەفرۆشت.
٣٧٦ -دوكانی نەهرۆ حمدامین تەلەفزیۆنی چادەكردەوە.
٣٧٧ -دوكانی مستەفا حاجی كەریم تەلەفزیۆنی چادەكردەوە.
٣٧٨ -دوكانی مغدید شیلەیی ماست و سەوزەی دەفرۆشت لە نزیك چیشتخانەی ڕینگەبوو.
٣٧٩ -دوكانی كەریم شیلەیی ماست و سەوزەی دەفرۆشت لەنزیك چێشتخانی ڕینگە بوو.
٣٨٠ -دووكانی حاجی معروف وردەوارەی دەفرۆشت.
٣٨١ -دووكانی عوسمانە سور و صلاحی كوڕی وەردەوارەیان دەفرۆشتلە مەیدانی خوارێ بوون نزیك مزگەفتی گەرموك.
٣٨٢-دوكانی حاجی جەمال حاجی كەریم لیفەو دۆشەگی دەفرۆشت.
٣٨٣-دوكانی حاجی حسێن سالح نازەنینی كاسبی توتن و دار سپینداری دەفرۆشت.

ئەم دوكاندارانەش لەناو قەیسەری نوێ بوون لەپەنجایەكان:
٣٨٤-تایەری حەمەلار.
٣٨٥-عمر حاجی كریمە ڕەش بەزاز بوو.
٣٨٦-مامە وەستا عەبدە بەرگدروو.
٣٨٧-حویز مام یەحیا.
٣٨٨-مەلای طاهیر چلبی بەزاز.
٣٨٩ -صابر مستەفا بەرگدروو.
٣٩٠-حاجی حسن سكتانی بزاز.

٣٩١-عوسمان عباس برگدروو.
٣٩٢-محمد کەریم مامۆکە بەرگدروو.
٣٩٣-حمە دەرزی بەرگدروو.
٣٩٤-شفیق عبدلرحمن ببەرگدروو.
٣٩٥-کمال حاجی مجید.
٣٩٦-مام عباس لێف دروو.
٣٩٧-سەید سعید لێفدروو.
٣٩٨-مام شاکر سعاتچی.
٣٩٩ -فتاح حاجی عەوڵا ببەرگدروو.
٤٠٠-بکر بەنا ببەزاز.
٤٠١-کاکە حاجی محمود بزاز.
٤٠٢-مەلا صدر بهائەدین بزاز.
٤٠٣ -کەیفی حاجی سمایل بزاز.
٤٠٤ -شێخ جمال احمد لێف فرۆش.
٤٠٥ -حاجی رەفیق داروغا.
٤٠٦ -فەرەنسی.
٤٠٧ -یوسف حنا بەرگدروو.

ئەمدووکاندارانەش لە قەیسەری کەون بوون:
٤٠٨ -مام کەریم باوکی زۆراب بەزاز.
٤٠٩ -ئەبرەها حنا بەرگدروو.
٤١٠-عزیز عبداللە دەرزی.
٤١١-حمە علی فەقێ برایم بەرگدروو.
٤١٢ -عبداللە دەرزی.
٤١٣ -تایەر مەلا مولود لێفدروو.
٤١٤-حویز گەرگەر لێفدروو.
٤١٥ -ئەحمەد حەمە مەلا.
٤١٦-سید برایم سەید سەعید بزاز.

٤١٧ -شێخ باقی بەرمالی دەفرۆشت.
٤١٨ -مستەفا قادر سەردۆری بەرگدروو.
٤١٩-حەمە مەلا بەرگدروو.
٤٢٠ -کەریم حمە مەلا.
٤٢١ -عەبدە بەرگدروو جولەکە بوو.
٤٢٢ -ڕەفیق مەلا ئەحمەد بەرگدروو.
٤٢٣ -کاکەی بەرگدروو.
٤٢٤ -شەلکە زیرینگر جولەکە بوو.
٤٢٥ -سیمانە عتار جولەکە بوو.

ئەمە ناوی دوکاندارەکانی کۆیەیە لەپەنجاکان تا ئەم دوایی یە بەڵام بەداخەوە هیچیان لەژیان نەماون.

سوپاس بۆ کاک سەباح مام حسین، یارمەتیدەرم بوو بۆ ناوی دوکاندارەکانی ناو قەیسەری نوێ.







# زنجیرەی پەنجاو دوو

## (قوتابخانە و خوێندنی جارانی کۆیە)

جاران خەلکی زۆر ئارەزومەندبوون بۆ خوێندن لەگەل ئەوەی پێداویستییەکانی خوێندن زۆرکەم بوون ژیان گران بوو بەشی زۆری باوکەکان مندالەکانیان دەبردە سوختاخانەی مەلا کەمال و حوجرەی مزگەوتەکان هەندێک ئافرەتیش هەبوون فەقێ بوون شارەزاییان لەقورئان و خوێندنەوەی هەبوو فەقێ رابعە و فەقێ عیسمەت و فەقێ رەعنا و فەقێ گورێ و فەقێ صبیحە هتد.

لە زنجیرەکانی رابردوو باسی کردنەوەی قوتابخانەی کۆرانمان کردلەگەل کردنەوەی قوتابخانەی ئێوارانی کوران و کردنەوەی قوتابخانەی کچان ئێستا باسی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی دەکەین جاران بالەخانەی قوتابخانەکان ئەهلی بوون بەکرێ گیرابوون خوێندنیان تێدا ئەنجام دەدرا دەگێرنەوە یەکێک لەو قوتابخانانە لە خانووی مالی حەمەشین دابووە لەبەرامبەر مزگەوتی منارە یەکێک لەقوتابخانەکانی دیکە لەجێ ی کۆنە مەکتەبە بووە بەندەش قوتابی بوو لەقوتابخانەی قادریە لەخانووی مالی خوالێخۆشبوو حاجی جەلال و خانووی حاجی مجید.

جاران قوتابی دوو دەوامی دەکرد لە رۆژێکدا چوار دەرس بەیانی تا١٢نیوەرۆ، دوای نیوەرۆ دوو وانەبوو. لەسەعات٢نیوەرۆ تا٤:٣٠دەقیقە بەرێوەبەری قادریە مامۆستای خوالێخۆشبوو مجید نورالدین بوو.بەرێوەبەری قوتابخانەی ناوخانووی مالی حەمەشین خوالێخۆشبوو تاهیر سەعیدبووە. بەرێوبەری قوتابخانەی اولی لەکۆنە مەکتەبە خوالێخۆشبوو مامۆستا جلال حوێز بووە.

جاران باوک مندالی کە دەبردە بەرخوێندن بە بەرێوەبەرو مامۆستاکانی دەگوت کوری ئێوەیە گۆشت بۆ ئێوە ئێسک بۆ من بەمانای لێ ی بدەن بەس فێربێ وەک ئێستا نەبوو مامۆستا نەتوانێ چ بکات هەموو بەیانییەک ریز دەکراین بەرێوەبەرو مامۆستایان و

فەراشەکان هەر هەموویان لەگەل ئێمە رادەوەستان بەرێوەبەر شورکە هەنارەکی ئەستوری بەدەستەوەبوو لە ناو ساحە رادە وەستاو ئامۆژگاری قوتابیانی دەکرد پیاو نەبوو جولە بکات دوایی بەناو ریزی پۆلەکان دادەگەرا تەماشای دەست و پەنجەو نینۆک و هێخەی کراس و سەر دەستی دەکردین هەر قوتابییەک پیس بووایە پشتی ملی دەگرت و فرێ ی دەدا ناوساحە ئەوجا وەک چۆلەکە دەلەرزین دوایی بەرێوەبەر هەریەک پێنج شەش داری بەهێزی خۆی لەناوپەلی دەدایین دوایی ناوی ئەم قوتابیانەی دەخوێندەوە کە بێ عاریان کردبوو یا لە کۆلان شەریان کردبوو یا مامۆستا شکاتی لێکردبوون خودا ئاگادارە بیست داری پێ دەکەوت هەبوو میزی لەبن خۆی دەکرد هەندێ قوتابی فەلاقە دەکرا.

دوو فەراش مان هەبوو چوار شانەبوون یەکیان ناوی عومەر ئەحمد شوان ئەوی دیکە دەروێش قادر کاک عومەر لە عاردی دەدایین مام دەروێش هەر دوو لاقەکانی بلند دەکردین و دەیخستە بن پیلی وەک گیرەی نەجاران جولەی لێ دەبرین جەنابی مدیریش بە ئارەزووی خۆی پانزدە دارێکی بەتوندی لەبنی پێمان دەدا بەرێوەبەر دەیگوت پیاو نەبی دەتکەمە پیاو دوایی بە دەروێشی دەگوت ئەم سەیەی بەردە سەرەرای ئەم لێدان و فەلاقەیە شەقێکی لێدەدایین خاترانە ئەمەی سەیربوو کە هەلدەستاینەوە گێر دەرۆیشتین ئەگەر باوکمان بیزانیبا کە فەلاقە کراوین ئەویش هەندەی ئەو دار کاری دەکردین بۆ بەیانی باوکمان دەهاتە قوتابخانە داوای لێبوردنی دەکرد.

جگە لەمانە دەفتەرو قەلەم زۆرکەم بوو باوکمان بەزەحمەت بۆی دەکرین بۆ ئەوەی ئاگامان لێ ی بێ باوەرتان هەبێ دەبوو قەلەم کە کورت دەبۆوە تەسلیم باوک و دایکمان بکەین بلێین زۆر گچکەیە دەستم نایگرێ ئەوسا قەلەمێکی دیکەیان بۆ دەکرین چونکە یاری قەلەم قەلەمانێ هەبوو کتێبی خوێندن زۆر کەم بوو بە دوو سێ قوتابی یەک کتێبمان وەردەگرت هەر هەشت سەعات لای یەکێک بوو دەبوو بچی لەبەر دەرگای برادەرەکەت چاوەرێ بکەی کتێبەکەی لێ وەربگری بە پاک و خاوێنی کورسی دانیشتن تاک کورسی گچکەبوو.

ئەمەی شایانی باسە جاران لە ناو دەرسی چوارەم مراقبی گشتی پۆل بەپۆل لە دەرگای پۆلی دەدا ناوی قوتابی یە نەخۆشەکانی دەنووسی لە دەفتەرێکی گەورە کە دەوام تەواو دەبوو قوتابییەکان دەچوونە لای ژوری بەرێوەبەر کۆدەبوونەوە مراقب گشتی بەخۆی و دەفتەرەکەی لە پێش قوتابی یەکان دەرۆیشت قوتابیەکانیش وەک سەرباز بەریز بەدوای دەرۆیشتن هەر قوتابییەک شوشەیەک یا بتلەکی پێ بوو بۆ شروب ئەگەر شوشەی پێ نەبووایە دەبوو لەبەر دەرگای خستەخانە شوشەک بکرێت بۆ دەرمان دکتۆر هەموو قوتابی یەکانی فەحص دەکرد دەفتەرەکەی ئیمزا دەکرد ئەگەر قوتابی یەک پێویستی بە پشوو بووایە لەدەفتەرەکە دەینووسی هیچ قوتابی یەک نەیدەوێرا لەرێگا خۆی بدزێتەوە قوتابخانەی قادریە لەتەنیشت مزگەوتی مەلا ئەسعەد بوو.

جاران خستەخانەیەک هەبوو دەرگای بەرامبەر گوزەری کورتان درووان بوو خوار دەرگای تەکیەی تالەبانی مراقب کە قوتابی یەکانی دەبرد بۆ مستوصف واتە خەستەخانە بەناو قەیسەری گەورە دای دەهێنان و دەیبردنەوە گوزەری کورتان درووان لەویشەوە بۆ ناو خستەخانە.

جاران هەندێ دەرمان بەکاردەهات ئێستا بەکارنایەت تەن ترێ بۆ برین حەبی دۆڤەر بۆ کۆخە دەرمانی گلسرین بۆزار کولی بەکاردەهات جاران بە زانستەکانیان دەگوت ئەشیا و صحە لەپۆلی چوارەم دەخوێندرا لەگەڵ کۆمەلایەتی ئینگلیزی لەپۆلی پێنجەم دەخوێندرا قوتابی هەموو توانای لەسەر خۆی بوو لە سالی ١٩٦٠لە خانوی حاجی جلال جێگامان نەدەبۆ وە خانوی مالی حاجی مجید کە نزیک مەکتەب بوو کرا بە پاشکۆی قوتابخانەی قادریە تا پۆلی سێ یەم بردرا بۆ ئەم خانووە. خانووەکە حەوشی نەبوو دەرگایەکی لە پشتەوە هەبوو لەسەررەزان بوو بەم شوێنەیان دەگوت بەردی قەسابان لەم شوێنە وەرزشمان دەکرد بۆیەش پێیان دەگوت بەردی قەسابان چونکە ئێواران

قەسابەکان لەم شوێنە دادەنیشتن معامەلەیان دەکرد بەردێکی سپی گەورەشی لێ یە بۆیەش لەم شوێنە معامەلەیان دەکرد چونکە بازرگانی گەورەی ئاژەل حمید قەساب مالیان لەوێ بوو.

لە ساڵی ١٩٦٣ قوتابخانەی قادریە چووە دەباخانان هەوراز دائیرەی زراعەی کۆن نزیک مالی مەلا صدر بوو بەقوتابخانەی کویسنجق کچ و کور تێکەل کراچونکە زۆربەی مامۆستایانی کۆیە گیرابوون لە ساڵی ١٩٦٦ جارێکی دی قوتابخانەکە گوازراوە بۆ بالەخانەیەکی دیکە کە دروستکرابوو لەلایەن حکومەت لە دەرگای خۆشناوان قوتابخانەی اولی لە گەرەکی دیانان لەهەمان کات قوتابخانەی باواجی لە شوێنی کۆنە سەرا کراوە بەرێوەبەرەکەی مامۆستا زەکی ئەحمەد هەناری بوو سەرای کەون لە کۆتایی پەنجاکان گوازراوە سەرای نوێ ی ئێستا سەرای کەون کە گوازراوە بەشێکی بوو بە قوتابخانەی باواجی مامۆستا قادر مەلا عبداللە معاون بوو ئەمەی جێگای ئامازەیە لەتەنیشت سەرای کەون بە لای مزگەوتی گەورە نادی فەرمانبەران هەبوو لەم جادەیە بە پانزدە قادرمە بەسەر دەکەوتی بۆ ناو حەوشەی نادی باخچەیەکی خۆشی هەبوو لەهەوراز نادییەکە مستوصف هەبوو کە دەرگای بەرامبەر گوزەری کورتان درووان بوو لەرەمەزان مەلا عبدالرحمن لەسەر قادرمەی نادی مەندیلی با دەدا پێش بانگ بۆ ئەوەی حمد عەبۆ تۆپی رەمەزان بتەقێنی جگە لەمانە سجنی سەرا کەوتبووە لای مالی کاکە سور ئەمەی گرنگە باسی بکەین لە ساڵی١٩٥٩/ز دوای شۆرشی ١٩٥٨/٧/١٤ مقاومەی شەعبی پەیدابوو شوعیەکان بالا دەست بوون لەناو سەرای کۆن مەشقیان دەکرد جلکی خاکییان لەبەر بوو پانتۆرەکانیان کورت بوو کاسکێتیان لەسەر بوو دوایی کرا ئۆرزدی بازاری هاوچەرخ هەموو پێداویستی یەکی لێ دەفرۆشرا فەرمانبەرێکی زۆریش کاریان تێدا دەکرد لە دوای راپەرین ئەم شوێنەش نەما چەند قوتابخانەیەکی دیکە هەبوون وەک سەرباغ چوار باغ زانست شیرین بۆکچان بوو لەخانووی صمد حاجی

طه بوو قوتابخانەی کویسنجق قوتابخانەی امینە لەبەرامبەر کارگەی تەنقیح بوو خانووی مالی عبدالرحمن چلبی بوو لەدوای راپەرین کراوە بەدوکان بۆیەش پێیان دەگوت امینە چونکە بەرێوەبەرەکە ناوی ست امینە بوو خوشکی مامۆستا زکی هەناری ئێستا لە کۆیە بەدەیەها قوتابخانەی سەرەتایی ناوەندی و دواناوەندی هەیە جاران لە قوتابخانەی سەرەتایی کەشافە هەبوو بەقوتابیان دەکرا جل و بەرگی خاکیان لەبەر دەکرد کاسکێتیان لەسەر دەنا جاران قوماش سالانە دابەش دەکرد بەسەر قوتابیانی هەژار جگە لەمە لەناوەراستی پەنجاکان بەسەرەوە رۆژانە خواردنی شیر و پەنیرو مۆزو هێلکە وحەبی ڤیتامین/D و شەربەت دەدرا بەقوتابیان .

بەلێندەرەکە حەوێز صابر بوو ناسراو بەحوێز خارە برای مستەفا عەرەب بوو جگە لەمە بەلێندەری خواردنی بەندیخانەش بوو ئەم پیاوە باشە بەر تەقینەوەی ئەلغام کەوت لەرووباری کۆیە بەهاران قوتابی قوتابخانەکانیان بەپاص دەبرد بۆ سەیران لەهەیبەت سولتان نان و هێلکە و تەرە پیازمان دەبرد لەکاتی چوونمان خوا خوامان بوو پاسەکە زوو نەگاتێ بۆ ئەوەی زیاتر سواری پاس بین چونکە سەیارە زۆر کەم بوو جاران هەندێک یاری هەبوو لەقوتابخانە مامۆستای وەرزش پێی دەکرن.

١-کورسی کورسیانێ: مامۆستا شەش کورسی لەساحەدا دەنا حەوت قوتابی دەردەهێنا کە مامۆستا فیکەی لێدەدا هەرحەوت قوتابی بەدەوری کورسی یەکان دەسورانەوە لەپر مامۆستا فیکەیەکی دیکەی دەکرد بە خێرایی هەر قوتابییە لەسەر کورسییەک دادەنیشت یەکێک بێ کورسی دەمایەوە دەر دەکرا یەکێکی دی دەهاتە جێی.

٢-زۆر جاریش کڵاوکڵاوانێیان دەکرد قوتابی یەکان دادەنیشتن یەکیک بەدەوریاندا دەسورا پارچە پەرۆیەکی لەپشت یەکێکیان دادەنا لەپر چاویان دەکردەوە یەکێک بەخێرایی دەیگوت لەپشت فلانە ئەگەر راست بایە دەیبردەوە ئەو قوتابییە ئەو جارە دەسورا پەرۆکەی لەپشت یەکێک دادەنا بەم شێوەیە گەمەکە بەرێوە دەچوو.

٣-یاری تۆپ، شەبەکە، سەلە، تۆپی پێ.

ئێستا ناوی سەرجەم قوتابخانە بنەرەتی و دوا ناوەندی و ئامادەیی و باخچەی ساوایان و قوتابخانە ناحکومیەکان دەخەینە روو.

قوتابخانە بنەرەتی یەکان:

١-قوتابخانەی باکور

٢-قوتابخانەی کوردستان

٣-باواجی

٤-قوتابخانەی کەکۆن

٥-قوتابخانەی حەمامۆک

٦-قوتابخانەی زانست پێیان دەگوت ثانیا، لەساڵەکانی پەنجا بەرێوبەرەکەی ناوی خوالێخۆشبوو(سابیر اسماعیل)، یاریدەدەرەکەشی مامۆستا(عبدالرحمن امین)بوو

٧-قوتابخانەی کێلە خوار

٨-قوتابخانەی هامون

٩-قوتابخانەی حاجی قادر

١٠-قوتابخانەی رۆژئاوا

١١-قوتابخانەی چرا

١٢-قوتابخانەی کۆسرەت

١٣-قوتابخانەی چنارۆک

١٤-قوتابخانەی یەکیەتی

١٥-قوتابخانەی کۆیەی یەکەم

١٦-قوتابخانەی ئۆمەر خوچان

١٧-قوتابخانەی شیرین

١٨-قوتابخانەی حاجیلە

١٩-قوتابخانەی دلدار

٢٠-قوتابخانەی رەنو

٢١-قوتابخانەی ژین

٢٢-قوتابخانەی نەورۆز
٢٣-قوتابخانەی نەجیبەخان
٢٤-قوتابخانەی مەلای گەورە
٢٥-قوتابخانەی رۆژهەلات
قوتابخانە بنەرەتی یە ناحکومیەکان
٢٦-قوتابخانەی برادۆست
٢٧-قوتابخانەی کۆمەلگەی پەروەردەیی کۆیەی ناحکومی
٢٨-قوتابخانەی کۆیەی ناحکومی
٢٩-قوتابخانەی نەوەی دوا رۆژی ناحکومی
٣٠-قوتابخانەی گەشتیاری

خوێندنگا ناوەندییەکان:

١-خوێندنگای ناوەندی هەرمۆتە
٢-خوێندنگای ناوەندی سێوە
٣-خوێندنگای ناوەندی ئەختەر
٤-خوێندنگای ناوەندی سروە
٥-خوێندنگای ناوەندی دلکۆ
٦-خوێندنگای ناوەندی کۆ دەشت
٧-خوێندنگای ناوەندی ئەردەلان
٨-خوێندنگای ناوەندی مەهاباد
٩-خوێندنگای ناوەندی پێشەوا
١٠-خوێندنگای حەمە ئاغا
١١-خوێندنگای ناوەندی هەیبەت سولتان
١٢-خوێندنگای ناوەندی سەرباغ
١٣-خوێندنگای ناوەندی مەندیلان
١٤-خوێندنگای ناوەندی نێوزەنگ
١٥-خوێندنگای ناوەندی دەرسیمی ئێواران
١٦-خوێندنگای ناوەندی گولیزارخان

١٧-خوێندنگای ناوەندی هەلگورد
١٨-خوێندنگای ناوەندی مەنفی

خوێندنگا ئامادەییەکان:

١-خوێندنگای دواناوەندی چرۆ
٢-خوێندنگای دواناوەندی هیڤار
٣-خوێندنگای دواناوەندی سیابۆ
٤-خوێندنگای دواناوەندی کۆیەی کوران
٥-خوێندنگای دواناوەندی کۆیەی کچان
٦-خوێندنگای دواناوەندی ئامەد
٧-خوێندنگای دواناوەندی زەلێ
٨-خوێندنگای دواناوەندی بەیداغ
٩-خوێندنگای دواناوەندی سامی عەودال
١٠-خوێندنگای دواناوەندی هیوا
١١-خوێندنگای دواناوەندی راجی

باخچەی ساوایان:

١-شەنگ
٢-شیلان
٣-باخچەی کۆیە
٤-بنەوشە
٥-گول
٦-رەنگالە
٧-هەنگ

جگە لەم هەموو قوتابخانە و خوێندنگای ناوەندی و دواناوەندی زانکۆو پەیمانگاش لەم شارە هەیە جگە لەهەموو ئەم ناوەندانەی خوێندن لەم شارە قوتابخانەی ئیسلامی هەیە لەگەل دەیەها مزگەوت بۆیە هەقمە ناوی بنێم شاری زانست پێویستە شارەوانی کۆیە

لەهەردوو بازگە سەرەکییەکەی شار لەسەر لەوحەیەک بنووسرێت بەخێربێن بۆشاری زانست جاران بەرێوەبەر بەتواناو لێ هاتوویی دادەنرا بەلام لەناوەراستی حەفتاکان بەدواوە پێوەری دانانی بەرێوەبەری قوتابخانەکان دەبوو ئەو بەرێوەبەرە پەیوەندی حیزبایەتی هەبووایە دوای راپەرین لایەنە سیاسییە دەسەلاتدارەکان هەمان رێگایان گرت بۆ دانان و دەست نیشانکردنی بەرێوەبەر.

م.مەجید نورەددین | م.ئەحمەد دلزار مستەفا | م.سدیق عبدالقادر

م.شەفیق تاهیر داروغا | م.جەلال حەمەد | م.زەکی ئەحمەد هەناری | م.زاهیر ئەحمەد هەناری

م. مەجید نورەددین و دەستەیەک لە قوتابیانی قوتابخانەی قادریە

## زنجیرەی پەنجاو سێ

### (پیشەوەرە کۆنەکانی کۆیەی جاران)

هەروەک لە زنجیرەکانی پێشوو باسمانکرد لەشاری کۆیە هیچ کەسێک بە بەتالی دانەدەنیشت هەرکەسە خەریکی کارێک بوو بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان پێشینان دەیان گوت گۆشتی رانی خۆت بخۆ لەمنەتی قەساب باشترە بۆیە خەلک کاری دەکرد بۆ ئەوەی چاوی لەدەستی کەس نەبێت جاران چەند کەسێک هەبوون حەمامچی بوون پێش باسکردنیان باسی حەمامەکانی کۆیە دەکەین لەم شارە چەند حەمامێک هەبوون تەنها لە تورکیا هەبوون بەراستی شوێنەواری زۆر دەگمەن و سەرنج راکێشەربوون بەلام دوای راپەرین لەگەل زەوی یەکسان کران و کرانە زەوی نیشتەجێ کردن ئەمەش لەبەدبەختی کۆیەو حکومەتی هەرێمی کوردستانە چونکە رێژەی پێشکەوتنی هەموو میللەتێک بەشوێنەوارەکانی پێوانە دەکرێت.

ئێستا باسی یەکە یەکە حەمامەکان دەکەین کە خۆم لەسەرجەمیان شوشتووە بەواقعی:

١-حەمامی پیسکان لەدەباخانان بوو نزیک مالی مەلا صدر مەلا بهاءالدین پشتی دەکەوتە سەر پردی گۆرستانی دەروێش خدر بەجوانترین ئەندازەی تەلارسازی دروست کرابوو رووبەرێکی زۆری زەوی داگرتبوو کە لە دەرگای حەمام دەچوویە ژوور قاعەیەکی گەورە هەبوو لەناوەراستی قولە تێنێکی گەورە هەبوو لەهەر چوار دەوری حەوزەکە کۆسپە هەبوو بەبلندی نزیکەی ٨٠سم، بەرەو لبادی لەسەر راخرابوو خەلکی کە دەچووە حەمام جل و بەرگی لەسەر ئەم کۆسپانە دادەکەند بوخچەکەشی هەر لە وێ دادەنا ئەگەر شتێکی بەنرخت پێ بوایە وەک پارە سەعات ئەوە تەسلیم حەمامچی دەکرا.

حەمامچی باولەکی بەرمیلی گەورەی لەتەنیشت خۆی دانابوو قوفلەکی گەورەی پێوەبوو ئەمانەتەکەی دەخستە ناوو قوفلی دەدا مام کاکە باوکی مامۆستا عبداللە کاکە سەرپەرشتی ئەم حەمامەی دەکرد

لەگەل کورەکەی خوالێ ی خۆش بێ کاک دلشاد دوای خۆگۆرین پەشتەمارێکی سۆرمان لەحەمامچی وەردەگرت لەخۆمان دەپێچا لەخوارەوە ئەوجا بەرەو شوێنی خۆشوشتن دەرۆیشتین لەنێوان شوێنی خۆشوشتن و قاعەکە رێرەوێک هەبوو زۆر گەرم بوو لبادچی لبادیان لێ دەگێرا لبادچییەکان لبادیان لەسەر ئەرز رادەخست دەیەها جار ئەم لبادەیان لول دەداو دەیان کردەوە رۆژانە لبادچی یەکان دەهاتنە ئەم حەمامە شوێنی خۆشوشتن چوار تاقی قەوسی گەورەبوو هەرتاقێک چوار جورنەی بەردی تێدابوو هەر جورنە یەک دوو بەلوعەی لەسەربوو لەتاقی ناوەراست دەرچەیەک لەناوەراستی دیوار هەبوو لەم دەرچە ناتری حەمام دەچووە ناوی شوێنی ئاوی گەرم بوو ئەگەر ئاوی گەرم نەمابایە یا کێشەی هەبووایە ئەوە ناتر دەچووە ناو ئەم شوێنە.

جاران گەورە بووین دایکمان بوخچەی لەپشت دەبەستین لەگەل خۆیان دەیان بردین بۆ حەمام خەلک زۆرکەم لە مال خۆی دەشوشت ئەگەر حەمامیشیان هەبووایە ئەوە هەر دەچوونە حەمامی دەرەوە جارێک کە لەگەل دایکم چوومە حەمام وا رێککەوت ئاوی گەرم نەما ژنان دەستیان کرد بە قاژ و قیژ و جا می زەردیان لە عاردی دەدا وەک جەرەس بوو یا پیرۆز خێزانی مام کاکە بوو ژنێکی چوار شانە هات گوتی چیتان دەوێ گوتیان ئاوی گەرم نەماوە پاش چەند دەقیقەیەک یاپیرۆز هات دەستی کابرایەکی گرتبوو کیسەیەکی لەسەری کردبوو بۆ ئەوەی هیچ نەبینێ بەناو ژنەکانی داهێنا هەر ژن بوو بەرووتی هەلدەهات و خۆی دەدا پەنا باوەرتان هەبێ کە ژنەکان هەلاتن و بوو بە مشەوەشی زۆر ترسام گوتم دەبێ چ قەومابێ.

هێدی هێدی یا پیرۆزو مام حسینی حەمە مەلۆی کیسە لەسەر دەرۆیشتن هەر زوو زوو یاپیرۆز دەیگوت حسین خۆ چاوت نابینی حسین دەیگوت واللە دەستم بەردەی ملم دەشکێ سندانم دەگاتێ تا دەیبردە ناو دەرچەکە دەچووە ژورێ ئاوەکەی چاک دەکرد کە دەیویست بێتە دەر لە دەرگاکەی دەدا یا پیرۆز بەهەمان شێوە

کیسەکەی لەسەری حسین دەکردەوە و دەیبردە دەرەوە ژنان لەپەناگاکانی حەمام دەهاتنە دەرەوەو دەیان گوت رۆیشت.

جالەوەش خراپتر ئێمە گەورەبووین هەتا دایکم دەیشوشتین چەندین چەپەرۆکیان بەسەرمان دادەدا پێیان دەگوتین سەر گەورە سەر لەبەر خۆت بنێ بێ ئەوەی هیچ بزانین وەک مندالی ئەم سەردەمە تازە دەزانم بۆ پێیان دەگوتین سەر لەبەر خۆت بنێ هەیاسە لە حەمامی ژنان چ باسە؟.

سەرشۆرینی گەوران درهەمێک بوو مندالیش نیو درهەم ئەوەی سەیربوو ژنان لەسەعات هەشت دەچوونە حەمام نیوەرۆ دەهاتنەوە حەمام دوو شەفت کاری دەکرد شەفتی سەعات ٨بەیانی بۆ ٢ ی دوای نیوەرۆ شەفتی دووەم لە٢ /ی دوای نیوەرۆ بۆ ٧بەیانی.

لەحەمام ناتر هەبوو لەهەردوو شەفت پشتی خەلکیان دەشوشت بەنیو درهەم کاری مەساج و شێلانیان دەکرد.

لە تەنیشت حەمام کورە هەبوو بەقادرمە دەچوویە خوارێ لەوێوە ئاگریان لەکورە بەردەدا حەمام بەنەوت و گاز و دار و هیتەر گەرم نەدەکرا بەلکو بەزبلی ولاخ گەرم دەکرا لە هاویندا رۆژانە زبلی خانەکانی کۆیەیان بەگوێ درێژو تێرکە دەکێشا دەیان بردە شوێنێک نزیک کورەی حەمام دەیان کرد بەگردێکی گەورە دوایی سواغیان دەدا بەپێ ی پێویست رۆژانە دەیان سوتاند جاران خانەکان زۆر قەرەبالغ بوون ئەمەی زبلی دەکێشا (کاک صالح وسو بندیان، کاک حمید صالح وسو بندیان بوو).

حەمامی پیسکان بەمولکایەتی هی بنەمالەی طاهر چلبی بوو ئەمەی جێگای داخە دوای راپەرین ئەم شوێنەوارە لەگەل خاک یەکسان کراو کردیان بە زەوی نیشتەجێ بوون بەلام نازانم فەرمانگەی شوێنەوارەکانی کۆیە چۆن رێگەی پێدان مێژووی شارێک پێشێل بکەن لەپشت ئەم حەمامە هاوینان چایخانەیەکی زۆرخۆش هەبوو هەتا درەنگانی شەو چونکە شوێنەکەی بلند و فێنک بوو دەی روانی یە سەر شیوی رەزان خاوەنەکەی بکر مام قادر بوو ناسراو بە بەکری چایەچی.

جگە لەمانە گەلێک کەس خاولی خۆ ووشکردنەوەی پێ نەبوو خاولی حەمامی بەکاردەهێنا دو جۆر خاولی هەبوو پەشتە ماری سۆر لە خۆیان دەپێچا لەکاتی خۆشوشتن خاولییەکیش بۆ خۆ وشک کردنەوەبوو سەیرە رۆژێک لەرۆژان تەندروستی بەکارهێنانی خاولی یەکتری قەدەغە نەدەکرد لەحەمام چای دار چینی و شیر هەبوو لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو ئەگەر یەکێک بچووبایە حەمام چ ژن چ پیاو هەموو کۆیە دەیزانی چونکە ئەوەی دەچووە حەمام بوخچەی جلکەکانی لەبن کەوشی دادەنا جانتا نەبوو بەراستی سەردەمێکی خۆش بوو خۆزگەم بە مندالی جاران.

٢-حەمامی ناوەند:لە بازارە گچکە لەبوو لەرووی پێکهاتە هاوشێوەی حەمامی پیسکان بوو بەڵام لەرووی تەلار سازی حەمامی پیسکان لەهەموویان جوانترو پێشکەوتوو تربوو مام خدر سەرپەرشتی دەکرد لەشەفتی ژنان خەجاو مام صالح بوو بەهەمان شیوەی پێشو گەرم دەکرا پێش مام خدر سۆفی عەولای برای مام خدر سەرپەرشتی حەمامی ناوەندی دەکرد بە داخەوە لەگەل خاک یەکسان کراوە.

٣-حەمامی حسن ئاغا چەند مەترێک لە مزگەوتی محمودئاغا دوورە دەکەوێتە گەرەکی قەلات پشتی دەکەوتە سەرقازیلان لەرووی پێکهاتەو گەرم کردن و هەندێک شتی دیکە هاوشێوەی حەمامەکانی دیکەیە خوالێخۆشبوو حەسەنە خرە برای مێرەمێ سۆلان سەرپەرشتی دەکرد لە سەرەتا دوای نەمانی ئەو سۆفی عەولا سەرپەرشتی دەکرد دوای نەمانی ئەو خوالێیخۆشبوو عوسمان ئاغای جافە سەرپەرشتی دەکرد لە رووی تەلارسازی هەموویان بە گونبەت دروست کرابوون خۆم لەم حەمامەش شوشتووە بەداخەوە لەگەل خاک یەکسان کراوە بووە بەگەراجی وەستانی سەیارە.

٤-حەمامی جمهوری لەگەرەکی دیانان لەسەر جادەی سەرەکی بە رانبەر باخچەی فریشتەی ئێستا لە جێ ی کۆنە قەسابخانە دروستکرا لە دوای شۆرشی١٩٥٧/٧/١٤ کاک محمد جافە سەرپەرشتی دەکرد ژنەکەی یاهەیبەت لە شەفتی ژنان بوو ئەم حەمامە حکومەت دروستی

کرد گونبەت نەبوو وەک خانووی ی گەورە بوو جێگای خۆشوشتن قاعەیەکی گەورەبوو جورنەی ئاوی تێدابوو ئەم حەمامەش تێکدرا وەختێک کرا گەراجی شارەکان ئێستا کراوە بەریزە دوکان جیاوازی ئەم حەمامە لەگەل ئەوانی دیکە ئەوەیە ئەم حەمامە بەنەوتی رەش گەرم دەکرا.

٥-حەمامی ئاسۆ هی مالی وەستا حسین نەجار بوو لەبەرامبەر کۆنە مەکتەبە بوو لەسەرەتای حەفتا دروست کرا هاوشێوەی خانوو دروست بوو قاعەکی گەورەبوو جورنەی تێدابوو کاک مستەفای مام کەریم دەباغچی و مندالەکانی سەرپەرشتیان دەکرد بە نەوت گەرم دەکرا بەلام دوای راپەرین تێکدراو کرا بەریزە دوکان بە راستی کۆیە بە شوێنەوارو شیوی رەزانی جوان و ناوبانگی هەبوو کەچی لە سایەی بەرپرسەکانی دوای راپەرین شاریان کرد بە وێرانە ئەوەی دوژمن نەیتوانی بیکات بەرامبەر ئەم شارە ئەوان لەپەنا پەردەی کوردایەتی کردیان سەرەرای هەموو ئەمانە پێش هەموو شتێک ناوی شاریان لە کۆیسنجق کرد بەکۆیە واتە لەویلایەتەوە کردیان بە شارۆچکە ئێستا بچییە هەر شارێکی عێراق یا داوای بەلگەنامەیەکی فەرمی بکەین تا نەلێی کویسنجق کارت جێ بەجێ نابێت و لێت حالی نابن لەمەش کارەسات بارتر کۆیە کەوتۆ تە نێوان بەرداشی وێرانکاری نێوان دوو لایەنی سیاسی هیچ یەکێکیان بە هی خۆی نازانێت.



حەمامی پیسکان



## زنجیرەی پەنجاو چوار

### (کۆیەی جاران)

لە زنجیرەکانی پێشوو باسی شاری کۆیەمان کرد لەهەموو بوارەکانی ژیاندا رۆلی بەرچاو و کاریگەری هەبووە لەم شارە هەندێک شوێن هەیە زۆر دیارن بوونەتە خالی ناسینەوە بەلام ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین هەندێک لەم شوێنانە بەناوی هەندیک کەسەوە ناو دەبرێن کە نە لە دوور نە لەنزیک خاوەنداریەتی بۆ ئەوان ناگەرێتەوە:

١-گردی عەلی مەحمود دەکەوێتە رۆژئاوای کۆیە بەسەر هەرمۆتەو شیلەدا دەروانێت بۆیە بەم ناوەکراوە چونکە عەلی مەحمود کە لەهەولێر بە عەلی گاور ناسراوە یەکەم سایق بووە کە رێگای هەولێر کۆیەی کردۆتەوە و پێ ی داهاتووە مام عەلی هەموو جار کە نەفەری هێناوە لە هەولێر بۆ کۆیە نەیتوانیوە بگەرێتەوە شەو لە کۆیە ماوەتەوە هەموو کاتێ کە مابێتەوە ئێوارەکەی بەخوی و شوشە ئارەقێکی قاچاغی یا وارێ چویتە سەر ئەم گردەو سەری خۆی گەرم کردووە بۆیە گردەکە بەناوی ئەوەوە ناو دەبرێت ئەگەر نا مافی مولکداری بەسەر ئەم گردەوە نی یە لە هەولێر مام عەلی بە عەلی گاور ناسراوە لەسالی ٢٠٠١ کۆچی دوایی کردووە لە سالی ١٨٩٨ لەدایک بووە کورەکەی مامۆستایە بەناوی یونس علی محمود بەندە سەرپەرشتیاری قوتابخانەکەیان بوو قوتابخانەی هیوا لەناو سەنتەری هەولێر.

٢-گردی قالەرەش دەکە وێتە رۆژهەلاتی کۆیە سەر پردی ئازادی لەسالّی پەنجاکان خوالێخۆشبوو قالە رەش باوکی کاک رەفیق یەکەم کەس بووە خانووی لەسەر ئەم گردە دروست کردووە بۆیە ناوی گردەکە بەناوی ئەو ناودەبرێت ئەگەر ناملکی مالی حاجی تۆفیق وەرەسەکانیش مامۆستا مەلا عەلی و مام خدر و کاک عبداللە و هەمینەخان و رەحمەخان و یاخەجاوە.

٣-مزگەوتی مەلا معصوم خوالێخۆشبوو حاجی افندی دروستی کردووە مەلا معصوم کە لە هەورەمان هاتۆتە کۆیە بووە بە ئیمام و وتار خوێن بۆ یەکەم جار لەم مزگەوتە دامەزراوە ناوی ئەو بووە بە پێناسەی مزگەوتەکە مەلا افندی ناوی تەواوی مەلا ئۆمەر بووە برای حاجی عبداللە باپیری مامۆستا مجید حمید و وەستا رشید و وەستا خورشید مەلا افنی دوو کوری هەبووە کاک حمدامین حاجی ئەفەندی و تایەری حاجی افندی هەقە دائیرەی ئەوقاف لەو حەیەک بە ناوی خاوەنی سەرەکی هەلواسێ لەسەر دەرگای مزگەوتەکە ئەم زانیاریانەم لە دایکم و خالە تۆفیق وەرگرتووە چونکە حاجی مەلا ئۆمەر کە بەمەلا افندی ناسراوە ئامۆزای حاجی صالح داروغای باپیری دایکم بووە.

٤-گردی مەلا محمود ئەم گردە دەکەوێتە بەرامبەر کۆنە بلدیە کاتی خۆی مەلا مەحمودێک لەوێ نێژراوە ئێستا لەگەل خاک یەکسان کراوە و بووە بەگەراج جگە لەم ناوە لەکۆن بێ ی گوتراوە سەر باسکان.

٥-گردی مام جەرجیس لایەکی کۆنە خستەخانەو کۆنە حەساری مالی کاکە زیاد و لایەکی چوارتاقانە مام جەرجیس باپیری حاجی ابراهیم داروغایە خەلک بۆ کات بەرێکردن دەچوونە سەر ئەم گردە.

٦-گردی خەرمان سوتا دەکەوێتە گەرەکی جمعیە پشت یاریگای کۆیە کاتی خۆی خەرمانی گەنم لەوێ سووتاوە.

٧-گردی شێخ مستەفا لە نزیک سەر قەبرۆکان دەرگای خۆشناوانە لەسەر باخچە پلوسکێ کەئە م رەزە هی مالی عەبدەی سەلامی یە ئەم باخچەیە بە پلوسک ئاوی بۆ دەچوو ماوەیەک کاک حەمە شای حەمە علی جافە سەر پەرشتی دەکرد.

٨-گردی باویان دەکەوێتە رۆژهەلاتی کۆیە پشت دەروێش خدر کاتی خۆی دار باویەکی لێبووە مولکی مالی تاهیر چەلەبی یە.

٩-گردی قەمبەر گاوان دەکەوێتە نزیک گەرەکی جەوهەراوە نزیک نەقلیاتی کۆیە.

١٠-گردی چادر دەکەوێتە ڕۆژئاوای کۆیە سەرریگای هەولێر شێوەی لەچادر دەچێت.
١١-گردی دەرمانـاو دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی کۆیە نزیک بەشە ناوخۆییەکانی زانکۆ سەر ریگای چنارۆکی بلباسان ئاوێکی مەعدەنی لێ بوو بۆ خورشت باش بوو.
١٢-داری کەندە کۆخ دەکەوێتە سەرووی کۆیە سەر رێگای حەمامۆک جاران خەلکی کۆیە باوەریان وابوو ئەگەر کۆخەیان لێ بووایە دەچوونە بن ئەم دارە بۆیە پێی دەلێن کەندە کۆخ.
١٣-گردی سێوکە گەرەکی جمعیەیە.
١٤-گردی کوران دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی کۆیە نزیک حەمە بایزان کورەی گەچی لێبوو.
١٥-گردی عەرەبیان بووە بەگۆرستانی شەهیدان.
١٦-گردی زێبار لەپشت گەرەکی ئیسکانە ئاوێکی باشی لێ یە زۆر کەس لە کۆیە تارادەیەک ئاشنایەتی و شارەزاییان نی یە بەم گردانە کە شوێنی زۆر کۆنن.
١٧-گردی کە کۆن یا کردی قشلە دەکەوێتە ڕۆژئاوای کۆیە شوێنکە دەروانیتە سەر شاری کۆیە گۆرستانە قشلەش هە یە لەسەر ئەم گردە.



## زنجیرەی پەنجاو پێنج

**(پیشەوەرەکانی کۆیەی جاران)**

جاران وەک ئێستا تەکنەلۆجیا پێشکەوتوو نەبوو بۆ ئەوەی بتوانی لەرێگای ئامێرە پێشکەوتووەکانی سەردەم رێکلام بکەی بۆ فرۆشتنی کەل و پەل یا خانووبەرە جاران دوو پیاوی بەرێز بەم کارە هەلدەستان:

١-کاک عبدالله عەزیزی دەلال، ناسراو بە عبداللەی دەڵاڵ.

٢-حاجی حەمەدی دەلال.

ئەم دوو بەرێزە بەکاری فرۆشتن و مەزادی خانوو هەلدەستان وەک نووسینگەی کرین و فرۆشتنی خانوو بەرەی ئەمرۆ ئەمانە بەبازار دا دەهاتنە خوار رادەوەستان دەستیان دەخستە بن گوێیان هاواریان دەکرد بە دەنگێکی بەرز دەیان گوت مەزاد مەزاد خانووی فلانی کوری فلانی بە تاپۆی رەش دەفرۆشرێ شەش هۆدەو دوو هەیوان و حەوشەیەکی گەورەو حەمام و ئاودەستی تێدایە لایەکی خانووی فلانە لایەکەی دیکەی مزگەوتە پێشەوەی طریق عامە دەفرۆشرێت هەرکەسێک تالبە بابێتە فلان جێ بەم شێوەیە هەموو کۆیە ئاگادار دەکراوە لەفرۆشتنی خانووبەرە زۆرجار دادگا مولکی وەرەسەی دەفرۆشت بەهەمان شێوەی پێشوو خانووەکەی مەزاد دەکرد.

مام عبدالله ئەوجارە دەیگوت مەزاد مەزاد خانووی فلان کوری فلان کە لە گەرەکی بایز ئاغایە وەرەسەی فلان کوری فلانە دادگا دەیفرۆشێت بەمەزادی عەلەنی هەرکەسێک تالبە رۆژی شەممە ٢٠٢٠/٧/٦ سەعات نۆی بەیانی ئامادەبن بەم شێوەیە خانووی مولک دەفرۆشرا.

مام حاجی حمد جگە لەکاری دەلالی مردووشۆریش بوو.

جگە لەمانەی کەباسمانکرد بازاری کۆیە پاسەوانی هەبوو بۆ شەو ئەمەی بەم کارە هەلدەستا مام حەمەدی کەریم بوو ئێواران درەنگ بەناو بازار دادەهات دوکان بە دوکان قوفلەکانی رادەکێشا پاسەوانی

هەردوو قەیسەری مام فەقێ برایم بوو باوکی خوالێخۆشبوو حەمە عەلی بوو جگە لەمە هەموو بەیانی یەکی رۆژانی هاوین مام تایەر حەبۆر بازاری دەرشاند بەتەنەکە کە دەسکی داری پێوەبوو رۆژانە هەردوکانێک عانەیەکی پێ دەدا.

جگە لەمانەی کە باسمانکردن هەموو بەیانییەک دوورۆژنامە فرۆش لەیەک کاتدا دەهاتنە ناوبازار کە ئەمانە بوون.

١-حەمە بگرەز رۆژنامەی خەباتی دەفرۆشت، کە ناوی حەمە غەریب بوو.

٢-بەشیر گۆرگیس کە بە بەشیرە کۆر ناسرابوو رۆژنامەی ئازادی دەفرۆشت زمان حالی کۆمۆنیستەکان بوو ئەمەی گرنگە لەناو بازار هەردووکیان بەرامبەر یەک رادەوەستان کاک حەمە غەریب کە ناسرابوو بە حەمە بگرەز هاواری دەکرد دەیگوت خەبات خەبات بخوێنەوە خەبات زمانی زگماکی دایک.

لەهەمان کاتدا بەشیرە کۆر هاواری دەکرد ئازادی ئازادی داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ هەردووکیان بەدەنگە بەرزەکانیان بازاریان دەجۆشاند ناو بازاری کۆیە زۆرخۆش بوو قەرەبالغ و جەنجال بوو چونکە لەهەموو کوردستان روویان لەم شارە دەکرد بۆ کرینی پێداویستییەکانیان.

بۆ خۆشیتان هەردوکاندارێک هاوینان شاگردێکی هەبوو زۆر شەیتان بوون هەندێک دوکانداریش حەزیان لەگالتەو بەزم بوو زۆرجار شاگردەکانیان دەنارده سەربانی قەیسەری قولابە ماسییان بەداو شۆر دەکردەوە ئەگەر زەلامێکی جەمەدانی بەسەر لەبەر دوکانێک رابوەستابایە بۆ شت کرین ئەوە سەبر سەبر قولابە ماسی یەکەیان شۆر دەکردەوە لەجەمەدانی یەکەیان گیر دەگرد و بەرزیان دەکردەوە کابرا لەپر دەست بۆ سەرو جەمەدانی یەکەی دەبرد بەڵام پێ رانەدەگەیشت بیگرێ و نەهێڵێ بیبەن کابرا دەیگوت دایکتان واو وا لێ

بکەم بەری هەڵدەن دوکاندارەکانیش دەیان زانی مەسەلە چی یە کە جەمەدانی کابرایان بلند دەکرد دوکاندارەکان هەموویان هاواریان دەکرد کورە نەکەی کورەنەکەی کابرا دەشێوا نەیدەزانی چ بکا ئەوەی سەیر بوو کابرا ڕێگای چوونە سەربانیان پێ نەدەزانی هێندەی دی کابرا تورە دەبوو بەراستی بەزم بەزمی بازار بوو وای لێ هاتبوو لادێ یەکان کە دەگەڕانەوە لەگوندی بەیەکتریان دەگوت کەچوونە کۆیە ئاگاتان لەکلاوو جەمەدانییەکانتان بێ بلعەتی منداڵە کۆییان ئینە خراپە.



شەهید بەشیر جەرجیس یوسف



جەمال عیزەت جەلی زادە

## زنجیرەی پەنجاو شەش

### (کۆیەی جاران)

جاران هەندێک داب و نەریتی زۆر جوان هەبوو لە شاری کۆیە کە جێگای شانازینە بەڵام بەداخەوە هەندێک لەم داب و نەریتانە کال بوونەتەوە یان نەماون.

جاران ئەگەر خانەوادەیەک بووکیان بگواستباوە یا ئەگەر منداليان ببوایە یا ئە گەر خا نووی دروست بکردبایە یا ئەگەر خانەوادەیەک بهاتبایە گەرەک ئەوەدەبوو حواردنیان بۆ ببردبانەوە بەم جۆرە خواردن ناردنەوە دەگوترا (لە نگەری) لە نگەری بریتی بوو لە دوو بەلەمی شووشە برنج لەگەڵ مەنجەلێکی گچکە قەیسی و مەنجەلێکی گچکەی دیکە لەمەرەگەیەکی دیکە شوشە شەربەتێک یا قودووە چوکلاتێکیش دەبوو وەک شیرینی دابنێن لەسەر سینییەکە دوایی پەرۆیەکی ئالاو والایان بەسەر سینی یەکە دادە داو دایان دەپۆشت حەمالێک دەهات دەیخستە سەرسەری و دەیبردە ئەوماڵەی کە بۆ نەکەیان هەیە دوای گەیاندنی خواردنەکە حەماڵەکە دەگەراوە رۆژی دوایی یەکێک دەچوو کەل و پەلەکانی دەهێناوە بە پاک و خاوێنی ئەگەر ئەو کەسە منداڵ بووایە برێک پارەیان بۆ لەناو قاپەکان دادەنا بەهۆی ئەم داب و نەریتە جوانە خزمایەتی و پەیوەندی کۆمەلایەتی بەهێز دەبوو بەڵام بەداخەوە ئێستا وەک جاران گەرم و گوری پێوە دیار نییە جگە لەمە دوای لەنگەری بردنەوە ئەگەر ژن گواستنەوە بووایە دیاریەکیان دەبرد جا ئەنگوستیلە یا ملی زێر یا کەل و پەلی ناو ماڵ ئەگەر منداڵ بوون بوایە ئەوە ماشاءاللە ی زێریان بۆ دەبرد بەپێش نیچەوانی منداڵەکەیان دەخست یا بەکۆچکەکەی جاران منداڵ کۆچکی لەسەر دەکرا زستانان بۆ ئەوەی سەرمای نەبێ جگە لەمە لە کۆیە شیوی سفرە بۆ ماڵی مردوو دە برد راوە بەهەمان شێوەی لەنگەری بەڵام جیاوازی نێوان لەنگەری و سفرە لەم چەند خالە دەردەکەوێت.

١- لەنگەری بۆ خۆشی یە بەڵام سفرە بۆ پرسەیە.

٢- خواردنی لەنگەری دەبێت مەرەگەی قەیسی و چوکلاتی لەگەل بێ بەڵام خواردنی سفرە نابێ مەرەگەی قەیسی و شەربەت و چوکلاتی لەگەل بێ.

٣- سینی لەنگەری بەپەرۆی ئالاو والادا دەپۆشرێ بەلام سینی سفرە بەپەرۆی سپی دادەپۆشرێ.

حەمال کەسینی پەرۆ سپی لەسەر سەری بوو ئەوە خەلک یەکسەر دەیزانی سفرەیە و یەکێک مردووە بەهەمان شێوە ئەگەر پەرۆی رەنگاو رەنگی لەسەر بوایە ئەوە لەنگەرییە بۆ خۆشی یە بەڵام لە دوای راپەرین ئەم دوو داب و نەریتە کال بۆتەوە وەک جاران بە سینی نانێردرێتەوە یا ئەوەتا بە مە نجەل خواردن دەنێرنەوە یا ئەوەتا لەچێشتخانە خواردن دەنێردرێتەوە بەپێ ی نەفەرەکان.



## زنجیرەی پەنجاو حەوت

**(کۆیەی جاران)**

لە دێر زەمانەوە لە شاری کۆیە هەموو ئایین زاکان پێکەوە ژیاون وەک مسولمان و دیان و جولەکە رێزیان لەشوێنە پیرۆزە کانی خودا پەرستی یەکتر گرتووە وەک مزگەوت و تەکیەو خانەقاو دێرو کەنیشک لەگەل گۆری پیاو چاکەکانیان ئێستا لەکۆیە کەنیسەی دیانان لەگەل مزگەوتی گەرمک چەند مەترێک لێک دوورن جگە لەمە لە شاری کۆیە نزیک بازگەی کۆیە هەولێر پیاو چاکێک هەیە بەناوی (مەربێن قەدیشە) دیانە کانی کۆیە و هەرمۆتە بەهی خۆیانی دەزانن مسولمانەکانی کۆیە و دەوروبریشی بەهی خۆیانی دەزانن پێ ی دەلێن (شێخ محمدی دێرێ) مسولمانەکان دەچنە زیارەتی مرازی لێدەخوازن تا ئێستا هەردوولا دەچنە سەردانی و رێزی لێدەگرن لەکاتی جەژنەکان دیانان وەک جەژنی لە دایک بوونی حەزرەتی عیساو جە ژنی سەری سال و جە ژنی هێلکەی رەنگاو رەنگ واتە جەژنی فصح، مسولمانەکانی شار بەشداری جەژنەکانیان دەکەن و پیرۆزباییان لێدەکەن بەهەمان شێوە دیانەکان بەشداری بۆنە ئایینیەکانی مسولمانان دەکە ن و جە ژنە پیرۆزەیان لێدەکەن و بە شداری پرسەی یەکتر دەکەن.

لە کۆیە زۆر بنەماڵەو تایفەی بەرێز هەیە بەهۆی ژن و ژن خوازی هەرهەموویان بوونەتە یەک بنەماڵە هەر بۆیە خەلکی شارەکانی دیکەی کوردستان پێمان دەلێن (کۆیی و خۆیی) لەوەوەیە کەخزمایەتی و تێکەلی یەکی پتەو هەیە لەنێوان خانەوادەو و بنەماڵەکان بەلام لەم رۆژگارە خەلکێکی زۆر بەهۆی زروفی سیاسی لەشاری کۆیە رۆیشتوون و باریان کردووە بۆ شارەکانی دیکە وەک هەولێر و سلێمانی هەر گۆرانکاریەکی سیاسی رووی دابێ ئەوە شاری کۆیە پشکی شێری بەرکەوتووە و خە لکەکەی زەرەرمەند بووە دیارە لە مێژوو زۆرجار کۆیە رووبەرووی هەلاتن و راوە دوونان بۆتەوە هەر بۆیە حاجی قادر دەلێ:

له هەزاری یەکێک نا ناسمەوە گەر بەناو نیشان نەبێ
ئێستا کۆیە وای لێهاتووە بەشی زۆری خەلکی شارەکە لە زێدی باوک و باپیرانیان نەماون هەر وەک باسمانکرد لەشاری کۆیە چەندین بنەماڵە هەیە بەڵام دووبنەمالەیان لەمەراسیمی جەژن جیاوازن لەگەل بنەمالەکانی دیکە.
١-بنەمالەی حەوێزی یەکان نابێت چێشتی برنج بۆ جەژن دروست بـــکەن لە یەکەم رۆژدا هەربـــۆیە هاوســـێ کانیـــان لە رۆژی یەکەم خواردنیان بۆ دەنێرن بۆ بەیانی حەوێزیەکان خواردنیان بۆ لەهەمان قاپ و مەنجەل دەکەنەوە بۆیان دەنێرنەوە ئەم داب و نەریتەیان لە باوک و باپیرانیان بۆ بەجێ ماوە گوایە گەرچێشت دروست بکەن مردوویان لێ دەمرێت یا رووبەرووی خەم و کارەسات دەبنەوە.
٢-بنەمالەی غە فوریەکانیش چیشتی برنج دروست ناکەن پلاو ساوار واتە ساوار بەهەرشتە لێدەنێن بەهەمان شێوە هەندێ هاوسێ چێشتی برنجیان بۆ دەنێرنەوە.
کۆیی یەکان لەجەژن پلاو برنج و مەرەگەی قەیسی دروست دەکەن دوایی پێشوازی لە میوانان دەکەن و گەردەن ئازایی لە یەکتر دەکەن منداڵانیش جل و بەرگی جوان و ئال و والا لەبەر دەکەن بەرەو شوێنی جەژن کە چەرخ و فەلەکیان پێ دەگوت بەرێ دەکەوتن کورو کچ سواری چەرخ و فەلەک و جۆلانەی هەلواسراوی بەگوریس دەبوون لەکاتی بادانی چەرخ و فەلەک بەدەستی منداڵان دەیان کرد بەهەلاو خۆشــی و پێکەنــین زۆرجــار کە کاتەکەمــان تەواو دەبــوو داوامــان لەخاوەنی چەرخ و فەلەک یا جۆلانەکە دەکرد خولەکی کەمان پێ بکات.
جگە لەم یاریانە سواری گوێ درێژ و عارەبانەی پشتی ولاخ دەبووین هەندێ جاریش منداڵێکی زۆر سواری سەیارەی لاندرۆڤەر و لۆری و گەلابەو تراکتەر و پاسی مستەفا مەروان دەبووین چونکە کەس سەیارەی نەبوو حەزمان دەکرد لە سواری سەیارە خوا خوامان بوو پێمان لە ئەرزی جیابێتەوە بەراستی لەزەت و خۆشی خۆی هەبوو

لەجەژن پاقلاوەو لوقم و شەکرۆکەو مەعجون و لەبزینەو شروب و شەربەت دەفرۆشرا جگە لەمانە کور سواری پایسکل دەبوون دوو بەرێز هەبوون لە کۆیە پایسکلیان بەکرێ دەدا بەمندالان دەقیقەی بە فلسێک.

١-مستەفای مەلای.

٢-خوالێخۆشبوو کاک عبدالله برای صلاح سبع.

ئەوەی سەیرو سەمەرەبوو جاری وا هەبوو درەنگ پایسکلەکەمان دەهێناوە کاک عبدالله خۆی سواری پایسکلە شرەکەی خۆی دەبوو بە دوامان دادەهات ئێمەش لەترسان پایسکلەکەمان بەجێ دەهێشت کاک عبداللە لە دوورەوە پەنجەی لێرادەوەشاندین دەیگوت ناپەسندینە رامەکەن وەرنەوە پارەی ئەم بیست دەقیقەم بدەنێ هەلدەهاتین گوێمان نەدەدایێ ناچار کاک عبدالله دەگەراوە.

باوەرتان هەبێ پایسکلەکان زۆرکۆن بوون هەرخەریکی زنجیر چاککردن بووین هەندێک سوار دەبووین زنجیری دادەمارا جادەکانی کۆیە تەنها ئەم راستە جادەی فولکە هەبوو زۆرجار پایسکلەکانمان دەبردە کۆلانەکان.

هەندێ گەمەی دیکەش لەجەژنە دەکران وەک یا نەسیب و لگا و شوێنی کۆ بوونەوەی مندالان لە جەژندا لەبەردەم مزگەوتی محمود ئاغا و حەمامی حسن ئاغا بوو پێیان دەگوت جەژنێ تا ئێستاش ئەم شوێنە بە ناوی خۆی جەژنێ ناو دەبرێ ئەگەر چی نەماوە جەژن تام و چێژی خۆی هەبوو شەوی جەژن لەخۆشیان خەومان لێ نەدەکەوت خوا خوامان بوو رۆژببێتەوە هەر تاریک بوو هەلدەستاین جل و بەرگی جەژنمان لەپشت سەری خۆمان دادەنا ناو ناو کە بەخەبەر دەهاتین دەستەکمان دەدا لە جل و بەرگەکانمان بۆ ئەوەی بزانین مایە یان نا جاران خانەوادەکانی کۆیە سەرجەمیان برنج و مەرەگەی جەژنیان بۆ بەیانی ئامادە دەکرد تام و چێژی هەبوو وەک ئێستا نەبوو کەس تاقەتی نەبی چێشت بۆ بەیانیان ئامادە بکات جگە لەمە بەیانی یەکەم

رۆژی جەژن خـزم و هاوسـێ سـەردانی ئەو خـانەودانەیـان دەکردکـە مردویـان لـێ مـردووەو یەکەم جەژنە لەمـانەش گرنگتـر پیـاوە ئـاینی وکەسایەتیەکان بەکاری ئا شتەوایی هەلدەستان لە نێوان ئەو کەسـانەی کــە ناخۆشـــییان لەنێوانـــدا هەیە رۆژانـــی جەژن کــاتی خۆشـــیو پێکهاتنەوەبوو ئەمە رۆژانی جەژنی شاری بلیمەت و زانایان بوو.



## زنجرەی پەنجاو هەشت

**(کۆیەی جاران)**

جاران لە شاری کۆیە هەندێک داب و نەریت هەبوون لەم شارە پیادە دەکران و باوەریان پێیان هەبوو.

١-شەوارە لە کۆیە ئەگەر یەکێک مرازەکی بخواست بایە ئێوارەی رۆژی هەینی لەسەر شەممە لەدوای بانگی ئێوارە کە تاریک دەبێت ئەو کەسەی کە مرازی لە دلدایە لە مال دێتە دەر لە سێ ریانی کۆلانەکەیان رادەوەستێ لەم کاتە ئەگەر هەر کەسێک بەم شوێنە تێپەرێ هەر قسەیەک بکات مراز خوازەکە بەهەندی وەردەگرێت بۆ وێنە ئەگەر قسە کەرەکان وشەی باش و خۆشیان بەکارهێنا ئەوە دلی خۆش دەبێ و دەگەرێتەوە بەلام ئەگەر قسەکەرەکان قسەی ناخۆشیان بەکارهێنا بەمانای وایە نابێت یا زەحمەتە، مراز گرەوەکە بە دل تەنگی دەگەرێتەوە زۆرجار چرایەک یالایتی سەیارەیەک بەرەو رووی دێ بەمەش خۆشحال دەبێت بەلام جاری واهەیە کەس بەم شوێنە تێپەر نابێ روناکی لە هیچ لایەکەوە نایەت مراز گرەوەکە دەگەرێتەوە هەفتەیەکی دیکە هەمان کار دووبارە دەکاتەوە بەم کارەیان دەگوت شەوارە.

٢-ئەگەر مندالێ شەو تای بگرتبایە ئەوە یەکێک لە ئەندامانی ئەم خێزانە ئێوارە لەگەڵ بانگ لە گەرەک لە دەرگای خانەوادەیەکی دەدا کە خاوەن دوو هاوسەر بوایە بە دەنگی بەرز دەیگوت بە شەو دەگرێ تا بەرۆژ بەردە دا پیاوی دوژنە چ دەرمان دەدا پیاوەکە دەهاتە دەرەوە هەر خواردنێکیان لەبەر دەمدا بوایە پێ ی دەگوتن وەک پلاو برنج ساوار نیسک هێلکە..هتد.

ئە و کەسە دەگەراوە مال خواردنەکەی ئامادە دەکرد دەیان دا بە نەخۆشەکە و چاک دەبوەوە.

٣-هەندێک مندال ئەگەر بێ تاقەت بووایە دەیان گوت ترسایە هەر بۆیە ئێوارە مس یان لەناو تاوەیەک گەرم دەکرد تا شل دەبۆوە دەیان

هێنا لەسەر سەری منداڵەکە هەندێک ئاو یان بەسە ر مسەکە دادەکرد مسەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا لەناو تاوەکە و ێنەیەک دروست دەبوو جاری وابوو وەک پشیلە بوو جاری وابوو وەک کەسێک یا باڵندەیەک بوو ئەوە دەیان گوت لەم شتە ترساوە.

٤-لە کۆیە ئەگەر یەکێک بالوکەی لێ بهاتبایە چەند کەسێک هەبوون بالوکەیان دەبری بەم شێوەیە دەبوو بەیانی ڕۆژی چوارشەممە گورچیلەیەک لەلای قەساب بکری لەگەڵ خۆت بیبەیە لای ئەو کەسەی بالوکەی دەبری ئەویش دوعای بەسەردا دەخوێند و لەناو پەڕۆیەکی دەبەست دەیگوت لەبن ئەرزی دا بنێ هەر کاتێ گور چیلەکە رزی بالوکەکان وردە وردە نامێنێن ئەمانەی ئەم کارەیان دەکرد کاک مەجید مام عوسمان و مستەفای حاجی قارەمان و نەنکە حەلیمەی دایکی باوکم و فەقێ سەعید دوای ئەویش منداڵەکانی ئەم کارە دەکەن.

٥-کەسانێک هەبوون ناوکیان دەهێناوە وەک نادری کارەبا و ئەحمەدی شینە.

جگە لەوانەی کە باسم کردن خەلکی کۆیەی جاران باوەڕیان بەهەندێ پیاو چاک و شێخ و هەندێ شتی دیکە هەبوو هۆکارەکەشی بۆ کەمی و نەبوونی چارەسەری پزیشکی دەگەڕاوە هەندێ جاریش بۆ لاوازی ئاستی زانیاری هەندێک باوەڕیان بەپیاو چاکەکانی ناو کۆیەو دەوروبەری هەبوو هەریەک بۆ مەبەستێک دەچوونە سەر گۆڕی باوکی فەقێ ئەحمەد لەناو قشلە بۆ مراز حاسل بوونی کچ و کور و ناجح بوون و منداڵ بوون یا ڕزگاربوون لەم کێشانەی کەڕووبەڕوو دەبنەوە دەچوونە بن داری کەندە کۆخ کە لەسەر ڕێگای حەمامۆکە بۆ چاک بوونەوە لە کۆخە ڕەشە دەچوونە سەر مەزارگەی هەیبەسولتان و ئەسحابان بۆ مراز جگە لەمە لەکۆیە چەند ماڵێک ڕێک دەکەوتن و ئامادە کاریان دەکرد و سەیارەیان بە پارەیەکی زۆر دەگرت دەچوونە سەر مەزاری ئۆمەر مەندان بۆ چاک بوونەوە لەهەموو نەخۆشییەکانی وەک خوگرتن لە خۆچوون و شێتی تا ئێستاش هە ندێ خانەوادە سەردانی ئەم مەزارگایانە و شێخەکان دەکەن.

جـگە لەمـانەی کە باسـمانکردن کەسـانێک هەبـوون بەکـاری چارەسـەری ئێسـک شـکان و هەر بەسـتنەوەی هەلدەسـتا وەک خوالێخۆشبوو حاجی حسێنی شیلە کە خزمەتێکی باشی کرد یەکێکی دیـکە لە کـۆیە بەکـاری هەر بەسـتنەوەی شـکانی دەسـت و لاقـی ولاخ هەلدەستا کە ئەویش خوالێخۆشبووان:

١-حەمەدی مەیتەر.

٢-وەستا بەهجەتی نالبەند.

٣-وەستا عەزیزی نالبەند.

مەزارگەیەکی دیکەش هەبوو لەبەرانبە ر کۆنە بەیتارخانە و خانی یا زبێدێ پێیان دەگوت شێخی شێخ موسرێ بۆ نیاز خەلکی دەچوونە زیـارەتی جـگە لەمـانە خەلکـی کـۆیە دەچـوونە سـەر مەزاری شـێخ محەممەدی بەرگەری نزیک هیران و کاموسەک بۆ باداری و لاق ئێشە نەخۆشەکەیان دەخستە ناو مەرقەد و حەیوانێکیان دەکردە سەدەقە.

جگە لەمانە خەلکی کۆیە دەچوونە بن داری ئەسحابان لـە نزیک بەنـداوی سـماقولی گەری بۆ مـراز قبـول بـوون جـگە لەمە لەم شـوێنە ئاوێکی کبریتی هەیە خەلکی دە چێتە ناو حەوزەکە بۆ نەخۆشـی پێسـتە و حەساسیە زۆرباشـە لە نزیـک ئەم شـوێنە لەسـەر رووبـاری گونـدی جەلی ئاوێکی کبریتی هاوشیوەی ئەم ئاوە هەیە بۆ نەخۆشـی پێسـت و حەساسیەت بەکاردێ هاوشێوەی ئاوی کبریتی حەمام عەلی کـە سـالانە خەلکێکـی زۆر رووی تێـدەکەن و دەسـتکەوت و واریـداتێکی بـاش بـۆ حکومەت بـە دەست دەهێنێت کە لـە ئاوەکە نزیـک بوویەوە هەست بە بۆنی کبریتی ئاوەکە دەکەی بەلام بە داخەوە ئەم شـوێنە گرنگە لەلایەن حکومەت پشت گوێ خراوەو هیچ جۆرە خزمەت گوزاریەکی سادەشی تێدا بەدی ناکرێ.

جگە لە ئـاوی کـانزایی کـە لەنـاوچەی کـۆیە هەیە لە دەورو پشـتی شـاری کـۆیە هەمـوو جـۆرە کـانزاو سـامانی سروشـتی دیـکەی وەک کانگای بەردی رەنگاو رەنـگ لەحەمـە خالدان لەچیای بـاواجی هەیە کە

بۆ دروست کردنی کاشی بەکار دەهێنرێت کانگای باشترین گەچ لە کۆیە هەیە بەشێوەیەکی زۆر لەدەوروبەری شاری کۆیە گلە سۆر باشترین گل بۆ دروستکردنی فرن و تەندوری نان پێشینیانی کۆیە گوتوویانە هەر شوێنێک گەچ و گلەسۆری لێبێت دەولەمەندە بە نەوت هەروەها گوتوویانە هەر شوێنێکیش کە گەسک و قامیشی لێبێت ئاوی لێیە ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە پێشینانی کۆیە شارەزایان هەبووە لەزانستی جیۆلۆجی لە شاری کۆیە جگە لەم سامانە سروشتیانە خاوەنی دەیەها بیرە نەوتی گەورەیە لە شیواشۆک کە لەسەردەمی رژێمی رابردووی عێراق دۆزراونەتەوە رۆژانە بەسەدەها تانکەر نەوت لەبیرەکانی شیواشۆک دەگوازرێتەوە بۆ بازارەکانی دەرەوە دەبوو حکومەت لە پارەی پیترۆ دۆلاری شارەکە خزمەت گوزاری پێشکەش بەم شارە بکردبایە شاری کۆیە هە میشە پێشە نگ بووە لە خەبات و پێشکەش کردنی خزمەت گوزاری بە مرۆڤایەتی مێژوو سە لمێنەری ئەم راستی یەیە.

## زنجیرەی پەنجاو نۆ

### (کۆیەی جاران)

جاران وەک ئێستا نەبوو منداڵ هیچ کەل وپەلێکی یاری کردنی سەردەمیانەی لەبەر دەست دانەبوو هەر بۆیە منداڵی جاران خۆی هەندێک کەل و پە لی یاری دروست دەکرد و کاتەکانی خۆی پێ بەسەر دەبرد بۆ وێنە مەزراحی دروست دەکرد لەدار یا هەندێ جار دەیکری لای دارتاشەکان یا لای ئەم هەجیجیانەی کە دەهاتنە کۆیە خول خولە و تەشی و بێژینگ و قەفەس و تیرۆگ و ناوبرێشکیان دەهێناو دەیان فرۆشت.

مەزراح بزمارێکی مەیلە و پانی بە ژێرەوە بوو منداڵەکان داوێکیان لە بزمارەکە دەئالاند تا ناوەندی مزراحەکە بەم داوە دەگوترا قەیتان کە مزراحەکەی بەتوندی هەلدەدا مزراحەکە لەسەر بزمارەکە دەسورێتەوە زۆر بەخێرایی مزراح کونێکی بۆ دروست دەکرێت زۆرجار دەنگێکی لێوەدێت چەند زیاتر دەنگی لێوەبێت ئەوەندە رەواجی زیاترە ئەگەر داری مزراح گوێز بێ مزراحەکە لای منداڵان رەواجی هەبوو منداڵان درێشەیان پێ بوو بۆ کوڵینی کونە مەزراحەکە بۆ ئەوەی ببۆرێنێ زۆرجار کێبرکێیان دەکرد لەسەر زیاتر سورانەوەو دەنگی مەزراحەکە منداڵانی کۆیە لەچەند گۆرەپان و کاولێک کۆ دەبوونەوەو یاریان دەکرد.

١-گۆرەپانی جاسم اغا لەبەر دەرگای ماڵی خوالێخۆشبووان عەبدەی فەقێ عیسمەت و ماڵی رینگە.

٢-کاولی عەلی بەگ بەر دەرگای مزگەوتی مەلا ئەسعەد.

٣-قۆنگرێ پشت باخچەی فریشتەو فەرمانگەی بەرگری شارستانی ناوی قۆنگرێ لە کۆبوونەوەو کۆنگرەی منداڵانەوە هاتووە.

٤-حەوشەی تەکێ ی تاڵەبانی.

٥-گۆرەپانی جەژنە بەر دەرگای مزگەوتی محمود ئاغا.

٦-گۆرەپانی تەم تەمان دەرگای خۆشناوان تا دەگاتە حەوزی بەلوعە.

٧-گردی مەلا مەحمود و گۆرەپانی پشت قوتابخانەی اولی جاران ئەم چەند شوێنە شوێنی کۆبوونەوەو یاری منداڵان بوو لە پشت نەخۆشخانەی کۆنی کۆیە.

٨-دیوی شوران واتە (بەردی قەسابان)ئەو شوێنە دەکەوێتە پشت پا شکۆی قوتابخانەی قادریەی سالانی کۆتایی پەنجاکان واتە پشت مالی خوالێخۆشبوو حاجی مجید پشت مزگەوتی مەلا ئەسعەد شوێنێکی فێنک و خۆش بوو مندالانی گەرەکی هەواوان و بایز ئاغا یاریان لێدەکرد جگە لەمە قەسابەکانیش کرین و فرۆشتنی مەرو مالاتیان لێدەکرد لەم شوێنە بەردێکی سپی گەورە هەبوو تا ئێستا ماوە.

جگە لە مزراح منداڵان کەلا بەردیان دروست دەکرد بەردی خالداریان لە چیای باواجی لە حەمە خالدان دەهێناو بەچەکوچەکی گچکە خەریکی دەبوون وردە وردە خریان دەکرد و لەدوای تەواوبوونی دەیان خستە ناو روون و گوێزو پەرۆیەکی تێدە ئالاند دوایی رەنگێکی جوانی پێ دەبەخشی هەندێک مندالْ کە لایانییان دەکرد هەش بوو کەلا موو شانێیان دەکرد پارەی ئاسنیان لە زەوی دەچەقاند بەتیل پارەکەی دەخست دەبوو بەهی ئەوکەسە.

جگە لەم یارییە جاران ئێواران منداڵانی کور قەلا قەلا یانێیان دەکرد دەبوونە دووتیپ تیپێک خۆیان دەشاردەوە یەکێک لە تیپەکەی دیکە کە لەسەر شار دانیشتوون لەگەل یەکێک لەم تیپەی کە خۆی شاردۆتەوە دەگەران بەدوایاندا نوێنەری تیپەکەی کە خۆیان شاردۆتەوە هاواری دەکرد دەیگوت خۆجە خۆت ماتکە لەلای مزگەوتێین ئەوە چوینە لای مالی فلان ئەوانەی کە خۆیان شاردبۆوە چاوەرێ ی ئەوەیان دەکرد فورسەتێک وەربگرن خۆیان بگەیەنەوە سەرشار ئەگەر لەکاتی گەرانەوە نەبینران بە براوە ئەژمار دەکرێت جارێکی دیکە خۆیان دەشارنەوە ئەگەر دوور بەدووریش ببینرێن ئەوە بەدۆراو ئەژمار دەکرێت زۆرجار هەندێک گەنج بەفێل دەچونە هەندێک مال بۆ خۆشاردنەوە خاوەن مال دارکاری دەکردن یاترپە تۆچای پێدا دەکردن جارێکی دیکە نەیان دەوێرا بچنەوە ئەم مالە جگە لەم یاری یە.

جۆره یاریەکی دیکه هەبوو پێیان دەگوت کێل و بەردانێ ئەم یارییه له دەرەوەی شار ئەنجام دەدرا سێ کێله بەردیان بەقیتی لەسەر زەوی دادەنا هەردوو کەسەکه هەریەکەیان خره بەردێکی پر بەدەستیان دەهاویشته بەرده قیتەکان ئەگەر هەر چی یەکیان توانی هەر سێ بەردەکه بخات ئەوه براوەیه بەم شێوەیه بەردەوام دەبێ.

جۆره گەمه و یارییەکی دیکه هەبوو پێیان دەگوت پەلیک پەلیکانێ دوو داریان دەهێنا یەکێکیان درێژیەکەی بستەک دەبوو دارەکەی دیکه نزیکەی مەترێک دەبوو بەداره درێژەکه له پەلیکەکەی دەدا چەند دوور برۆیشتبا نیشانەیان دەکرد ئەوی دیکه هاوشێوەی ئەو له پەلیکەکه دەدا ئەگەر لەو زیاتر رۆیی دەبێته براوه.

چەند جۆرێکی دیکەی یاری هەبوون وەک سێ رسکانێ و چاو شلکانێ و جیغزه و فری فریانێ و کلاو کلاوانێ هەندێک گەمەی دیکه هەبوون منداالان خۆیان پێوه خەریک دەکرد وەک دروستکردنی سەیاره بەتێل یا دروست کردنی کۆلاره و بەردەقانی و دار لاستیک یا گەمه بەرینگی پایسکل و دروست کردنی بەردەقانی له کۆیه پێ ی دەلێن قۆچەقانی جگه لەمانه منداڵان پیک و دوزەلەو نایه و شمشال و دمبک و دەفەشیان دروست دەکرد له پایزاندا که هەنارو هەنجیر پێ دەگەیشت رۆژانه دەچوونه ناو رەزو باخچەکانی شێوی رەزان زۆرجار رەزەوانەکان هەراسان دەبوون راویان دەناین و کەمینیان بۆ دادەنایەوه ئەگەر بگیرا باین لێدانەکی باشمان دەخوارد بەم شێوەیه مندالی جاران کاتەکانی بەسەر دەبرد.

کچی جارانی کۆیه ئەم یاریانەیان دەکرد وەک پەت پەتانێ شریتەکیان دەهێنا بەبن لاقی خۆیان دا دەهێناو بەخێرایی چەند جارێک خۆیان لەگەل بەرز دەکردەوه.

یاری شیشانێ لاکێشەکیا ن لەسەر زەوی دروست دەکرد دەیان کرده شەش خانه پارچه بەردێکی تەنکیان دەهێنا پێیان دەگوت ساپ کچەکان له کاتی یاری کردن قاچی چەپیان هەندێک بەرز دەکردەوه به

قاچی راسته پالیان بەساپەکە دەنا خانە بە خانە هەتا هەر شەش خانە تەواو دەبوو بەبراوە ئەژمار دەکرا نەدەبوو ساپەکە دوو خانە بەیەک جار ببرێت.

جۆرە یارییەکی دیکەی کچان هەبوو پێیان دەگوت پێنج بەردوکە پێنج بەردی وەک کەلایان دەهێنا بە دەست یەک یەک بەرزیان دەکردەوەو دەیان گرتەوە دوایی دوو دوو لەئەرز هەلی دەگرتن دوای سێ سێ دوایی چوار بەردەکەی بەیەک جار هەلدەگرت.

جگە لەمانە مۆری مۆریانەشیان دەکرد گۆرەپانێکی دیکە هەبوو لەپشت خەستەخانەی کۆن پشت حەساری مالی کاکە زیاد پێیان دەگوت ساحەی متوسطە چونکە حەسارەکە قوتابخانەی متوسطە بوو لەم شوێنە بۆنەکان و کێبرکێ و تۆپانێ و ئاهەنگی نەورۆز ئەنجام دەدرا بەلام ئێستا بووە بە خانووی نیشتەجێ بوون.








## زنجیرەی شەست

**(کۆیەی جاران)**

**سەرگوزشتەی شێتەکانی کۆیە**

شـتێکی روون و ئاشـکرایە لــە هەمــوو شــارو شــارۆچکەیەک کەسـانێک هەن بەهـۆی لە دەسـت دانی کۆنترۆلی دەمـاغ کە لەئیرادەو توانـای مرۆڤەکـان بەدەرە هەلسـوکەوتی جیـا لەمـرۆڤە سروشـتییەکان ئەنجام دەدەن سـەرنجی خەلکی بۆ لای خۆیـان رادەکێشـن لێرەدا دوو جۆر خەلک هەن هەندێک بەچاوی رێز سەیریان دەکەن و دەیان دوێنن بـۆ ئەوەی هەسـت بە دابـران و پشـت گـوێ خسـت نەکەن کەسـانێکیش هەن ئازاریان دەدەن و تورەیان دەکەن بۆ ساتێک پێکەنین و رابواردنی خۆیــان لە شــاری کــۆیە جــاران هــیچ هۆکارێــک و ئــامێرێکی وەک سەتەلایت و سەیارەی گەشت و گوزارو ئایپات و مۆبایل و ئینتەرنێت وفەیسبوک نەبوون بۆ ئەوەی کاتەکانی پێ بەرێ بکەن مندالانی کۆیەی جــاران ناچــار رۆژانە دەکەوتــنە دوای گەمەکــردن و گــالتەکردن بەشێتەکان.

ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین لاتـان سـەیرنەبێ شێتەکانیشـمان هەلسوکەوت و قسەکانیان لە وەلی و پیاو چاکەکان دەچوون هەندێک ژن و پیاو لە شاری کۆیە هەبوون لەم جۆرانە بوون، بوون بەمێژوو رۆژانە لە کۆرو کۆبوونەوەکـان قسـەکانیان و هەلسـوکەوتەکانیان بـاس دەکرێن.

١-خوالێخۆشبوو عبدالرزاق وەستا قادری کەبابچی خوالێخۆشـبوو برای کـاک جەلیل بـوو بەتەنهـا دەژیـا مالیـان لەپشـت حەمـامی حەسـەن ئاغا بوو ناسـرابوو بە عەبدول رەزاقە شـێتە بەلام قسـە خۆشـەکانی لە وەلی دەچوو ئەم پیاوە بەناو بازاردا دەهـات چـای سـەفەری دەفرۆشـت لەســەر تەنەکەیەکــی هەلپچــرا دەسـکێکی تێلــی تێخســت بــوو کتلــی و چاپەستە رەشەکەی لەسەردا دەناو بەناو بازار دەگەرا دەیگوت چا چای سەیفەین جۆرە چایەکی زۆرباشی سەیلان بوو خەلکی بـازاریش دەیـان

گـوت چـای رەش چـای رەش قـون رەش زۆر تـورە دەبـوو بەم دەستەواژەیە لە وەلامدا دەیگوت هـی دایک و باوکتـان رەش خەلکی دەیان گوت تورەمەبە دەیگوت کاکە باللە خودا فەرموویەتی چییان پێ گوتی پێیان بلێەوە.

جارێک مندالان زۆر هەراسانی دەکەن ئەویش تەنەکە سەفەریەکەی دادەنێ و بە دوایان رادەکاو مندالەکانی بۆ ناگیرێ ناچار جنێو بە دایک و باوکیان دەدا دەلێ ئەگەر دایک و باوکتان نی یە لە شەرەفی جیرانەکانتان بەم ئەگەر جیرانتان نی یە لە شەرەفی دەکیلۆ مەتر لەولاو ئەولاتان بەم دوکاندارەکان دەیان گوت کاک عبدالرزاق جنێو مەدە برۆ لای حاکم ئێستا شکاتیان لێ بکە ئەوە دەزانی کێنە دەروا بە قسەیان دەکا دەچێتە لای حاکم مەلا صدیق بە پاسەوانی بەردەرگای حاکم دە لێ بە حاکم بلێ کاک عبدالرزاق هاتی یە بۆ شکوا پۆلیس دەچێتە لای حاکم پەیامەکەی دەگەیەنی جەنابی حاکم بەپۆلیس دە لێ با بێتە ژورێ بەلام دەرگاکە داخە نەهێلی کەس بێتە ژوور.

کاک عبدالرزاق بەرێزەوە دەچێتە ژوورەوە سەلام دەکاو رادەوەستێ بەلام ماوەیەک دەستەکانی شۆرکردۆتەوە هیچ قسە ناکات حاکم پێ ی دەلێ کاک قون رەش بۆ قسە ناکەی عبدالرزاق دەلێ جەناب ئەمن هاتومە شکات لەگەوادان بکەم نەمزانی حاکم لەوان گەوادترە ئەمە رێک لەگەل ئێستا دەگونجێ دوای تورەبوونی حاکم دەلێ کاک عبدالرزق ئەگەر پێیان گوتی قون رەش تورە مەبە ئەوجارە عبدالرزاق بە حاکم دەلێ سەلام و علیکم حاکم وەلامی دەداتەوە جارێکی دیکە دەلێ سلام علیکم حاکم وەلامی دەداتەوە جاری سێ یەم جارێکی دیکە دەلێ سلام علیکم حاکم تورە دەبێ دەلێ نە علیک السلام برۆ دەرێ عبدالرزاق دەلێ جەنابی حاکم تۆ بە سێ سەلامی خودا قەرس بووی رۆژێ هەزار جار پێم دەلێن قون رەش کو تورە نەبم دوای چوونی بۆ لای حاکم خەلکی دەیان گوت برۆ لای حاکم شکات بکە دەیگوت لە مندالەکان بێ نا موسترە.

کاک عبدالرزاق هەمیشە گوێ درێژەکی هەبوو پەرۆی رەنگاو رەنگ و جاجمی لەسەر کورتانەکەی دادەنا منداله کۆیی هەقیان بەسەر کەرەکەی نەبوو دەیبردە چیای فەقێیان چیلکە و داری پێ دەهێنا بۆ سوتاندن لەوێ بەرەڵای دەکرد دەیگوت برۆ دەهاتەوە بەردەرگا عبدالرزق هاوینان چاوێلکەیەکی لەنایلۆنی کەسک بۆ کەرەکەی دروست دەکردو بەلاستێک لەولاو ئەولای گوێیەکانی قایمی دەکرد پوشی لەبە ردەمی دادەنا دەیگوت با بەگیای تێ بگات بەرامبەر کەرەکە رادەوەستاو چاودێری دەکرد دەی دیت کەرەکە دەمی بۆ پوو شەکە نەدەبرد کاک عبدالرزق دەیگوت باشە کە فێلت لێ نەکرێ بۆ پێت دەلێن کەر.

بە کاک عبدالرزاق یان دەگوت کاکە فلان نوێژ نەکەرە و فەرمەسۆن و مەشروب خۆرە چای مەفرۆشێ لە وەلامدا دەیگوت کاکە بالله لەو کەسە کەرتر نییە خۆی لەسەر خودا خراپ دەکا دەمان گوت وانییە دەیگوت کو وانییە ئەدی خودا لە.

قورئان نەیفەرمووە (ان اللە غنی عن العالمین) واتە خوا دەولەمەندە منەتی بەکەس نی یە.

کاک عبدالرزاق ئێواران درەنگ فروجاوی لەمەنجەلێکی گچکە دەکرد و دەیگەراند دەیگوت فروجاو خەلکی دەیان گوت حەزمان لە گۆشت کە لە شێرە دەیگوت لە سەرم بدەن درۆ ناکەم فروجە بە سەرهاتێکی دیکەی کاک عبدالرزاق بەیانی یەک لە مال دەهاتمە دوکانی باوکم لەناو بازار لەبەر دەرگای خانی مەحمود ئاغا کاک عبدالرزق بەرامبەر کتلی و چا پەستە رەشەکەی کە لەسەر تەنەکە هەلپچرایەکەی دانابوو لەسەر چیچکان دانیشتبوو دوو مامۆستای بەرێزی لەو لاو ئەولای دا نیشتبوون ئەوانیش خوالێخۆشبووان مامۆستا مامە مەلا فەتاح و مامۆستا واحد حمدامین کەبابچی کاتی چاوم پێیان کەوت بەرامبەریان راوەستام دیاربوو چاوەرێ ی چایان دەکرد و پێ دەکەنین مامۆستا مامە بە عبدالرزاقی دەگوت زۆر دەترسم

ئەوچا پەستە رەشە بجولێ و چا رەشەکە برژێتە سەر ئەم رەژووە رەشە دوای ئەو مامۆستا واحد هەمان قسەی دووبارە دەکردەوە عبدالرزاق دیاربوو پەست بوو بوو پێ ی گوتن باشە چا پەستەکە جێگای باشە بۆ دەلەقی گوتیان دەزانی بۆ دەلەقی گوتی بۆ هەر دووکیان پێیان گوت چونکە زەوی دەسورێت عبدالرزاق گوتی بەکام لا دەسورێ مامۆستا مامە گوتی بەلای واحد دەسورێ، باشە ئەگەر وایە بۆ ناکەویە سەر کۆشم دوای ئەو کاک واحد دەیگوت بەلای مامە دەسورێتەوە دەیگوت کەنگێن کەوتنە سەر کۆشم باوەرتان پێ دەکەم بەم جۆرە پێیان رادەبوارد قسەکانی لە پیاوێکی بلیمەت دەچوو زۆر بەسەر هاتوو قسەی خۆشی هەبوو.

فانۆسی بەملی کەرەکە شۆر دەکردەوە قەپاغەکی لەسەر فانۆسەکە دادەنا بۆ ئەوەی گەر مای نەگاتێ دەیگوت کەریش زیندە روحە با بەرچاوی خۆی ببینێ بەراستی هەموو هەلسوکەوتەکانی پێکەنیناوی بوون.

٢-لە کۆیە پیاوێکی دیکە هەبوو ناوی ئە حمەد مام برایم بوو ناسرابوو بە ئەحمەد گیانە قسەی خۆش بوو دەنگێکی زۆر بەسۆزو زولالی هەبوو سەری خۆی هەمیشە هەموو رۆژ سفر دەکرد خێزاندار‌بوو کورێکی هەبوو بەڵام بەهۆی لە دەستدانی کۆنترۆلی دەماغی نەیدەتوانی بژێوی ژیانیان دابین بکات خێزانەکەی داوای جیابوونەوەی کرد لە دادگا حاکم پێ گوت بوو کاک ئەحمەد خێزانەکەت وازلێبێنە با بۆ خۆی شوو بکاتەوە لەوەڵامدا گوتبووی گیانە تۆ ژنی خۆت بۆ خەڵاکی تەلاق دەدەی حاکم سەری سورمابوو لەوەڵامەکەی کەس نی یە لەکۆیە بەزمی گیانەو مینەو فاتە نەزانێ کاتێ فاتە دەلێ مینە لۆ هێندە قورسی ئەحمەد گیانە دەلێ گیانە مینە نی یە خۆمانین.

٣-پیاوێکی دیکە هەبوو بە ناوی حەمە رەفیق مام حەوێز قەساب ئەویش دەیگوت باوکی خەڵکی دەمری قەسرو قەمەرەی بۆ بەجێ دەهێڵێت هی منیش دەمرێ جووتە قۆندەرەیەکی تاکە و تاکی بۆ بەجێ

هێشتووم زۆر کفری دەکرد هەمیشە لەسەر گۆرستانی دەروێش خدربوو بەسام بوو.

٤-ستار ئاغا پیاوێکی چوارشانە بوو کاتی خۆی چەتە لێیان دا بوو لەکاروان شێت بوو بەکارخانچی تورە دەبوو هەمیشە عەورەتی لە دەرەوە بوو دەبوو بە فێل شەرواری لەبەر بکەن سەلامەت بوو.

٥-فایقە شێتی مەلا عەلی لە قۆنگرێ بوو لە گەرەکی هەواوان.

٦-سەید ئەحمەد بەترس بوو هەمیشە پارچە ئاسنی لە دەست بوو دەیگوت ئەگەر شۆرشت پێ نە دەکرا بۆ زەردەواڵەت هاردەکرد قسەکانی لەگەل سەرکردەکان بوو.

٦-دارا شێت خەلکی دەشتی کۆیە بوو.

٧-حەمە رەزا لە کۆماری کوردستان بەشداری کردبوو سەلامەت بوو هەر باسی سیاسەتی دەکرد بەگوللەی بەعسیەکان لە ١٩٦٣ز شەهید کرا.

٨-مەلا برایم خەلکی دەشتی کۆیە بوو.

٩-عبدالکریم خەلکی تیمارۆک بوو پیاوەکی بالا بەرزبوو بەهێلکەی کەرێ زۆر تورە دەبوو هەموو کۆلانەی کۆیەی پێ دەکردین.

١٠-هێندەک شێتی دیکەش هەبوون وەک مینەو رەحمان و فاتە ئەمانە خێزانێک بوون لە ئیران هاتبوون فاتە ژنەکی پان و پۆر بوو گۆپارەکی پێ بوو دەگەیشتە هەرکەسێک دەیگوت مینەو نەدیوە شەوانە لەسەر کۆسپەی ناو بازارو مزگەوتی گەورە دەنووستن.

١١-ژنەک هەبوو پێیان دەگوت قەپلاغدار مندالان گەمەیان پێدەکرد زۆر هەراسانیان دەکرد دوکاندارەکان بە مندالەکانیان دەگوت نابێ گەمەی پێ بکەن منداڵاکان پابەند دەبوون گەمەیان پێ نە دەکرد بەیانی قەپلاغدار دەهاتە ناوبازار مندالەکان بێدەنگ دەبوون قەپلاغدار دەیگوت ئەو قەحپەداکانە بۆ دەنگیان نییە ناچار مندالەکانی بە دەنگ دەهێناو دەستیان دەکردەوە بەگەمە پێ کردنی.

١٢-ژنەکی دیکە هەبوو ناوی پلکە سەفیەبوو دەرۆزەی دەکرد پارەیەکی زۆری لەپاش بەجێما.

١٣-ژنەکی دیکە هەبوو ناوی سەبری بوو.

١٤-ژنێکی تر هەبوو ناوی حەمدیە کاکە بوو.

١٥-هەندێکی دیکەش هەبوون باری دەروونیان تەواونەبوو کاکە ئەمین کاک قاسم کاک فریاد و کاک فاضل و مەلا محمد و نوری شاگردی خوالێخۆشبوو وەستا سەلامی نانەوابوو تورەدەبوو ئەگەر جنێوت بە (علی پۆزۆ) بدابایە لەکۆیە دەیان گوت خزمی بە نەزیر علی بۆتۆیە سەرۆک وەزیرانی پاکستان.

شێتەکی دیکە هەبوو ناوی قالە پیرەبوو زۆر قسەی بە ئاغاکانی کۆیە دەگوت لەخانی مەحمود ئاغا دەژیا ئامۆزای وەستا حەوێزی چەخماخچی بوو.

جگە لەمانە مەلا صالح شێت بوو هەمیشە کتلیەکی رەشی پر چای بەدەستەوە بوو چای بەتالی دەخوارد دەمی بەلولەی کتلی یەکەوە دەنا بەرەچەلەک تەق تەقی بوو هەروەها مەلا تاهیر پیاوێکی جوان کەواو چاکەتی لەبەربوو هەمیشە لەسەرگۆرستان بوو مەسینە ئاوی پێ بوو عەمود و کێلە قەبری ئاو دەدا ئایین کاریگەری لەسەر کردبوو باوەرتان هەبێ شێتەکانیشمان هۆشیارن هەلسوکەوتەکانیان لە وەلی زەمانە دەچوون بە داخەوە هیچیان لەژیان دا نەماون تەنها تاتە برایم لەژیاندا ماوە کە لەخانەی بەساڵاچووانی هەولێر ژیان بەسەر دەبات ژنێکی دیکە هەبوو ناوی یا روقیا بوو بەوە تیک دەچوو ئەگەر جوێنت بە ئاغا بدابایە.


سەید احمد


تاتە برایم


احمد گیانە


خارە ستار


نورە

## زنجیرەی شەست و یەک

### (بزوتنەوەی سیاسی لە شاری کۆیە)

بەهۆی رۆشنبیری و هۆشیاری خەلکی کۆیە لەدێر زەمانەوە ئەم شوێنە بۆتە مەیدانی بیرورای جیاواز هەر ئەمەش وای کردووە کە خەلکی ئەم شارە روو بەرووی نەیاران و دەسەڵات دارنی دوای شەری جیهانی یەکەم و رژێمە یەک لە دوایەکەکانی عێراق ببێتەوە سەر کەچ نەکەن بۆ نەیاران و چەوسێنەران هەر بۆیە دەستەیەک لەپیاو ماقول و جەر بەزەو قارەمانەکانی ئەم شارە چاو نەترسانە بەهێزو بازووی خۆیان و بەتوانایەکی سنوردار هێرشیان کردە سەر سەربازو جندرمەکانی تورک لەناو قشلەی کۆیە لەگردی کە کۆن بەپێ ی ئەم زانیاریانەی کە لەخارە تۆفیق حاجی تاهیر و دایکم نایلە حاجی تاهیر داروغا وەرم گرتووە یە ئەوانیش لە دایکیان خاتوو فەقێ رەعنای حاجی صالحی ئاو رەحمان بەگی سپینداره و خاتوو زەینەب مەلا فتح اللە مەلا عەباس گوتوویانە نزیکەی ١٨ کەس بوون هێرشیان کردە سەر قشلەو هەندێکیان لەسەر بازەکان کوشت و بریندارکرد هەندێکیشیان هەلاتن چوونە مالی جمیل ئاغای قایم قام و لای عەولا ئاغای حەوێزی هێرش بەرەکان سندوقی خەزنەیان دەست کاری نەکردبوو ئەمەش ناوی ئەندامانی جولانەوەی بەلشەفی بوو.

١-حاجی میرزا عبداللە خادم سەرۆک.

٢-حاجی طاهیر داروغای باپیرم جێگری جولانەوەکە بووە.

٣-مام حمدامین حاجی صالح داروغا نووسەرو کاتب بووە.

٤-مەلا تەهای نانەوا.

٥-عەدەی مام شێخ.

٦-حاجی تاهیر عبداللە خادم.

٧-حاجی فەقێ ی قەلادزێ.

٨-مام رەزای قەڵادزێ.

٩-مام فەتاحی قەڵادزێ ئەمانە هی کۆیەن لەبەر نیشتەجێ بوونیان لەقە لادزێ بەمە دەناسرێنەوە:

١٠-مام كەریمی گۆدەی، باپیری شەهید شەفیق زاهیر.
١١-عەدە قەوان.
١٢-حەمە قەوان.
١٣-مام سۆفی سعدالله ١٤-حمدامین شال قیت بەداخەوە ناوی ئەوانی دیکەیان بۆ باس نەکردبوون هەر کەسێک ناوەکانیان دەزانێ بابینوو سێ بۆم ئەم جولانەوەیە شکستی هێنا بە نەهێنی عەولا ئاغای حەوێزی بەشداربووەکانی بەرێ کردن بۆ بیتوێن بۆ لای سوار ئاغای حمد ئاغای گولاوی باوکی سمایل ئاغا و قادر ئاغا هەندێکیان لەقەلادزێ مانەوە هەندێکیش چوونە سلێمانی مام حمدامین چووە لای جمیل ئاغای حەوێزی عەفوی کرد.
ئەم جولانەوەیە لە سالی ١٩١٧ز روویداوە دوای سەرنەکەوتنی عەولا ئاغای حەوێزی دیلە تورکەکانی رادەستی سوار ئاغای حمد ئاغای گولاوی کرد ئەویش رادەستی تورکەکانی کردنەوە مام حمدأمین باوکی ستاری چایەچی بوو بەم دواییە توتن و جگەرەی دەفرۆشت مام حمدأمین خێزانەکەی جولەکەبو کچی برایمۆکی برای فەرەج بوو لە سالی ١٩٣٧ بەدواوە لە کۆیە بیرو باوەری کۆ مۆ نیستی بلاو بۆ وە دژی ئاغاو دە رە بە گە کان دوایی لەم شارە بیرو باوەری پارتی بلاو بۆ وە لە م شارە هەمیشە ئەم دوو بیرو بۆ چوونە لە ململانێی بەردەوام بوون لەم پێناوەشدا کۆیی یەکان باجێکی زۆریان داوە.


حاجی تاهیر داروغا


شاری کۆیە

## زنجیرەی شەست و دوو

### (بنەماڵەی جولەکەکانی کۆیە)

شاری کۆیە شاری پێکەوە ژیان بووە هەموو پێکهاتەو ئایین زاناکان بەو پەری سەربەستی و ئازادی خەریکی خواپەرستی خۆیان بووینە لەدێرو کەنیشکەکانیان لەشوێنە گشتی یەکان رێزیان لێگیراوە بەشداری بۆنە پیرۆزەکانی یەکتریان کردووە لەپرسەش هاوخەمی یەکتر بوونە لەم شارە دیان و جولەکەی لێ ژیاون و گەرەکی تایبەت بەخۆیان هەبووە تارادەیەک دۆستایەتی و خۆشەویستیان لەنێوان دا هەبووە دێر و کەنیسە و مزگەوت چەند مەترێک لێک دووربوون لەکاتی هێرشی داعش بەسەدەها خێزانی مەسیحی و ئێزیدی و کاکەیی روویان لەم شارەکرد خەلکەکەی باوەشیان بۆ کردنەوەو لەشوقەی مۆدێرن و مزگەوتی مەلا ئەسعەد نیشتەجێیان کردن و بەپێ ی توانا دەستی یارمەتیان بۆ درێژکردن ئەم جۆرە هەلسوکەوتە ئاستی رۆشنبیری خەلکی شاری کۆیە دەردەخات لە مەسەلەی نەتەوایەتیش هاوکاری یەکتربوون خوێنی دیان و مسولمان لەرەشبگیریەکەی ١٩٦٣/٧/٤ تێکەل بەیەکتربوو لەکاتی گولە بارانەکەی ١٩٦٣/٧/٧ جگە لەمە لەشۆرشی نوێ مامۆستا سەلیم حەنا لەسێدارە درا لەسەر رێبازی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان.

جولەکەکانیش وەک پێکهاتەیەکی رەسەنی شاری کۆیە لەلایەن کۆیی یەکان رێزیان لێگیراوەو بەرگریان لێکراوە بۆ سەلماندنی راستیەکان لەدوای کۆتایی هاتنی شەری جیهانی دووەم رەشید عالی گەیلان نازی فەرمانی دا بەکوشتنی جولەکەکان بەلاّم لەشاری کۆیە خوالێخۆشبووان مەلای گەورەو کاکە زیاد و جەمیل ئاغا و عبدالرحمن کوری محمود ئاغا رێگریان کرد و دەستی یارمەتیان بۆ درێژکردن و بەرگریان لێکردن ئەم زانیاریانەم لەدایکم نایلەی حاجی طاهر داروغاو خارە توفیق حاجی طاهر داروغا وەرگرتووە دەربارەی بنەماڵەی جولەکەکان.

بنەماڵەی جولەکەکان لەگەڕەکی بەفری قەندی نیشتەجێ بوون لەنێوان مزگەوتی حەتک و مزگەوتی گەرموک.

له پشت دوکانی وەستا حەمە عەلی ئاوێکی لێ بوو جولەکەکان ئاویان لێ دەبرد وەختێک بوو بەچایخانەی صالح شمس.

١-ماڵی خواجه صالحی مۆشکه.

٢-ماڵی حەیوم.

٣-ماڵی نوریه جو.

٤-ماڵی سلمان شموئیل.

٥-ماڵی دانیال زێرنگر بوو.

٦-ماڵی مالم نەسیم تاهیری مەلا حەبیب خانووەکەی کری.

٧-ماڵی عەزرەی پیاوی قایم قام بوو له کۆیه دەستەواژەی بەدایکی عەزره زۆر بەکاردەهێنن.

٨-ماڵی مام وسو واته یوسف مەی دەفرۆشت.

٩-سەمحه شەل و شوشەی کچی له ماڵی مام وسوی مەی فرۆش دەژیان.

١٠-ماڵی نوریه جو سێ برا لەیەک خانوو دەژیان نوری، نەزلی، ئیسرائیل

١١-ماڵی نەفتالین خم خانەچی بوو.

١٢-لەخوار ئەوان بەرامبەر مزگەوتی حەتک ماڵی وەستا گورجی زێرنگر.

١٣-ماڵی مام ئیسرائیل رووی لە غەریبان بوو زێرنگربوو نزیک مزگەوتی گەرمک.

١٤-ماڵی ناحێم بەرامبەر مەیدان لەبەرامبەر مزگەوتی گەرمک بازرگانی که تیره و مازی و خوری بوو دوکانی لەقەیسەری بوو کەواو چاکەتی لەبەربوو.

١٥-کۆلانەی ماڵی قادری یاسین مالی مام یاقۆ باوکی عمران زێرو زیویان چاک دەکردەوە.

١٦-لەهەمان کۆلان ماڵی مورتخای رەحینی بازرگانی قوماش بوو.

١٧-ماڵی ئیلیاهو لەکۆلانەی کلیسک بوو بەرجادەی کەوت بیری ئاوی تێدابوو بە پێنج قادرمە دەچوویە خوارەوە.

١٨-مـاڵی سـالحۆک بەتەمەن بـوو کـاری نەدەکـرد کـورەکی هەبـوو بازرگان بوو ناوی سیمانە بوو زۆر جوان بوو

١٩-ماڵی فەرەج.

٢٠-ماڵی برایمۆک، سالحۆک و برایمۆک و فەرەج برابوون.

٢١-شوان مام باروخ زێرینگر بوو بە ئاگر سووتا پیاوێکی زۆر جوان بوو.

هەندێک کۆیی ژنیان لە جولەکەکان هێناوە.

١-مـام حمـدامین حـاجی صـالح داروغـا کچـی برایمـۆکی هێنـاوە نـاوی عەیشێ بووە مامۆژنی دایکم بووە.

٢-فاتح ئاغا جلیل ئاغا فەیرۆزی هێناوە.

٣-حمید حاجی خەلیفە.

جولەکەکان چەند جەژنێکیان هەبوو.

١-جەژنی قیامە.

٢-جەژنی فەقیرە دارو دیواریان دەشوشت دیواری خانووەکانیان بەگل سپی دەکرد.

٣-جەژنی کەپرە شینە لەسەرەتای پاییز.

لەبەهـارێکی درەنگـی سـالی ١٩٥٠-١٩٥١ جولەکەکـان لە کـۆیە رۆیشـتن چـوونەوە ئیسـرائیل خەلکی کـۆیە بەرێزەوە خوا حافیزیان لێکـردن جولەکەکـان گریابوون گوتووبوویان ئێـوە کەل و پەلتـان لەئـێمە کـری بەڵام رۆژێـک دێ کەس لە ئێوە ناکرێ زۆر راست دەرچوو.



وێنەی کیژێکی کوردی جولەکە ساڵی ١٩٥٠ پێش رەوکردنیان بەرەو ئیسرائیل



## زنجیرەی شەست و سێ

**(رەشبگیریەکەی ١٩٦٣/٧/٤)**

پەنجاو حەوت ساڵ بەر لەئیمرۆ لە مانگی تەممووزشاری کۆیە رووبەرووی گەورەترین شاڵاوی رەشبگیری و گولەبارانکردن و تەقەکردنی هەرەمەکی لەهاوڵاتیانی ناوبازارو سەر شەقامەکان بووەلەمێژوو ئەم سەردەمە رەشە بەسەردەمی حەرەس قەومی ناسراوە کە دەستیان سوور بوو بە خوێنی گەنج و پیرو ژنی کورد حکومەتی ناوەندی بەغدای ئەوکات کە بەعسییەکان بوون هێزێکی میلیشیای لەعەرەبە کۆچەرو بەدوەکان دروست کردبوو ئاستی رۆشنبیریان لەخوار سفربوو هێنا بوویە سەر هەرێمی کوردستان پێیان گوترابوو سەر بۆ ئێمە تالانیش بۆ ئێوە بۆیە سلیان لەهیچ نە دەکردەوە هەر شتێکیان دەست بکە وتابایە بەتالان دەیان برد مەرو ماڵاتی گوندەکانیان راماڵی و بەتالان بردیان خەزێم و گوارەیان لە لوت و گوێ ی ئافرەت دەپچراند مریشکی کورکیان بەجوجەلەوە دەبرد هیچ نەما نەیکەن دوور لەبەها مرۆڤایەتیەکان کاریان دەکرد چونکە دونیا بە رووی کورد داخرابوو دەنگی نەدەگەیشتە هیچ شوێنێک هەربۆیە بەهەواو ئارەزووی خۆیان خەلکیان خەلتانی خوێن دەکرد حەرەس قەومی یە تاوانبارەکان هێرشیان دەکردە سەر هەرشوێنێک دەیان گوت (جای البدو وین العدو) لەگەل هەموو درندایەتیەکانیان هێرشەکانیان تێک دەشکێنراو کوشتارێکی باشیان لێدەکرا بەهیمەتی پێشمەرگە قارەمانەکان.

لە رۆژی١٩٦٣/٧/٤ بە عسی یە فاشست و خوێن رێژەکان لە ناو جەرگەی بازار لەمەیدانی خوارێ دەستیان کرد بەتەقەی کوێرانە شەلم کۆرم هیچ ناپرسم چەندین هاولاتی بێ گوناح خەلتانی خوێن کران بەهۆکاری ئەوەی کە سەربازێکیان کوژرا، لەوانە:

١-شەهید مەلا شێخ طاهر.

٢-وەستا حمید اسماعیل حاجی رسول دارتاش.

٣-جلال سمايل ئەحمەسور دوای تەقە کردنەکە قەدەغەی هاتووچۆیان ڕاگەیاند دەستیان کرد بە ڕەشبگیری و گرتن و کوشتنی ژن و مندالی ئەم شارە لەهەموو لایەک تەنها دەنگی هاوار و گریان و باوکە ڕۆدەهات باوەرتان هەبێ هاوشێوەی ئەنفال بوو دوای گرتنی سەدەها هاولاتی ئەم شارە بردنیان بۆ سەربازگەی کۆیە لەبناری هەیبەت سلطان هەر لەم ڕۆژە ڕەشەدا حەرەس قەومی یە فاشستەکان ئافرەتێکیان بەخۆی و کۆرپەکەی شەهیدکرد لە ناو مالی خۆی لە کاتی دەرگا کردنەوە بەناوی:

١-منیرە مەلا تاهیر جەلیزادە.

٢-کۆرپە نۆمانگی یەکەی کەلە باوەشیدا بوو بەناوی شوان صابر.

مەلا ڕەئوف جەلیزادە ئەم کارەساتە لە گەرەکی هەواوان بوو وەک شاهید حالێک باوەرتان هەبێ پیاو لەم شارە نەمابوو هەر بۆیە ژنی گەرەک کۆبوونەوەو تەرمەکەیان لەسەر دارە باز دانان و هەردوو شە هیدەکەیان بردن بۆ نەخۆشخانەی کۆیەی کۆن دوایی تەرمەکانیان لەپێش مەزارگەی دەروێش خدر بەخاک سپارد دەبوو بەرپرسەکانی کۆیە پەیکەرێکیان بۆ ئەم دایکە و کۆرپەکەی دروست بکردبایە هاوشێوەی شەهید عومەری خاوەر لە شوێنێکی گشتی دەبوو بە پێناسەی مەزلومیەتی میللەتێک بۆ مێژوو دەبووە لاپەرەیەکی پرشنگدار لە خەبات و قوربانی دان.

ئەمەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین سەرجەم گیراوەکانیان ڕەوانەی (بەندیخانەی موسەیەب کرد) لە خوارووی عێراق لەم ژمارە زۆرە تەنها شەش هاولاتیان ڕەوان نەکرد شار زۆرخامۆش بوو لەرۆژی١٩٦٣/٧/٧ سە عات ١٠/ی بەیانی لە بلند گۆی مزگەوتی گەورە جارێکی دیکە قەدەغەی هاتوو چۆ ڕاگەیەندرا دوای ئەمە هەرشەش هاولاتییەکانیان هێنا بەپشتێنی خۆیان لەدینگەکانی مەیدانی خوارەوەیا بەستن و گولەبارانیان کردن ئەمەی شایانی باسە خوێنی مسولمان و دیان تێکەل بەیەکتربوون دوای ئەنجامدانی ئەم کارە نامرۆڤایەتی یە داوایان

لەهاولاتیان کرد لەماڵەکانیان بێنە دەرەوە و قەدەغە بشکێنن هاولاتیان بەرەو شوێنی ڕووداوەکە چوون وەک شاهید حاڵێک سەرجەمیان خەڵتانی خوێن بوون و سەروملیان شۆرکردبۆوە بەراستی ئەمانە شەهیدن ئەمەش ناوی شەهیدەکانە:

١- محمد وهاب ئاغا حەوێزی لەگۆرستانی دەروێش خدر بەخاک سێردراوە.

٢- شەهید سلێمان حەمە قاوەچی لەگۆرستانی دەروێش خدر بە خاک سپێردراوە.

٣- شەهید حمدأمین ئەحمەد ئاغا لەگۆرستانی شەهیدان بەخاک سپێردراوە.

٤- شەهید شەفیق حمد چایەچی لەگۆرستانی شەهیدان بەخاک سپێردراوە.

٥- شەهید یوسف حەنا عەبدول کەریم بەرگدروو لەهەرمۆتە بە خاک سپێردراوە.

٦- حەنا یوسف تۆما خزمەت گوزار لە قوتابخانەی هەرمۆتە. لە هەرمۆتە باخاک سپێردرا.

ئەم شەهیدانە بەدینگەکانەوە مانەوە تارۆژی دوایی کەس بۆی نەبوو بەخاکیان بسپێری ڕۆژی دواتر مامۆستا مەلا عەلی حاجی تۆفیق و قەشەی کۆیە هەردووکیان بەخۆیان و قورئان و ئینجیل چوونە لای طه شەکرچی تاوانبار داوایان لێکرد ڕێگایان پێ بدات بەخاکیان بسپێرن هەموو ئەم تاوانانەی کە لە شاری کۆیە ئەنجام درا بەفەرمانی ڕاستەوخۆی جەلاد طه شەکرچی بوو خەڵکی موصل بوو لە ١٩٦٣/٦/٩ هەمان ڕووداوی زیندە بەچاڵکردن لە شاری سلێمانی ئەنجام درا لە سەر دەستی خوێن ڕێژ زەعیم صدیق یەکێک لە شەهیدەکان مامۆستا حاجی باقی کۆیی بوو برای برین پێچ کاک اکرم باقی و کاک بەهزاد باقی جگە لەمانە هەر لەهەمان کاتدا مامۆستا کەمال رشید ئاغای حەوێزی زیندە بەچاڵکرا لە ژێر پردەکانی بناری شاخی هەیبەت

سولطان لەدوای ئەمە شار زۆر خامۆش بوو خەلکی هەستی بەئارامی نەدەکرد هەمیشە لە دلەراوکێ دا بوو هەموو رۆژەکانی مانگی تەمموز کارەسات باربوون تارۆژی ١٩٦٣/٧/٣١ جارێکی دیکە بە فەرمانی فەرماندە ی سەربازی خوێن رێژ جارێکی دیکە چوار جوتیاری گوندنشین کە لەئاش دەگەرانەوە جە ستەیان بە ئاردبوو لەهەمان شوێنی پێشوو لەدینگەیان بەستن و گولە بارانیان کردن سێیان برا بوون ئەمەش ناوەکانیانە:



شەهید عبدالرحمن حاجی اسعد چلبی

١-شەهید حەسەن شەریف ئیبراهیم.
٢-حسێن شەریف ئیبراهیم.
٣-عومەر شەریف ئیبراهیم.
٤-قولی کێخوا عەلی کێلە سپی.

جگە لەمانە دوو کەلە پیاوی شاری کۆیە لە دۆلی سماقولی لەسەر دەستی طە شەکر چی شەهید کران.



شەهید جاسم عبدالرحمن حاجی اسعد چلبی لە ١٩٦٣/٨/١٣ گولەباران کران

١-شەهید عبدالرحمن چەلەبی.
٢-شەهید جاسم عبدالرحمن چەلەبی.
٣-شەهید مام عبداللە شوانکارەی مالی شەفیق ئاغا بوو لە تۆپزاوە شەهید کرا.

بەعسییە درندەکان هەرکاتێک لەروو بەروبوونەوە شکستیان بهێنابایە لە بەرەکانی شەر لەگەل هێزی پێشمەرگە کاری قێزەونیان ئەنجام دەدا بۆ شاردنەوەی شکستەکانیان بۆ چاوترسانی خەلک و ورەبەردان بەلام ئەم رەفتارانە خەلکی زیاتر جۆش دەدا بۆ خەبات شاری کۆیەی شەهیدان هەمیشە پێشەنگ بووە لەخەبات و قوربانی دان جگە لەپیاو چەندین شێرە ژنی دیکەمان لەبەندیخانەکانی بەعس و لە خۆپێشاندانەکانی ١٩٨٢ شەهیدبوون وەک:

١-شەهید خاتوو عەیشێ قادر یونس ناسراو بەعیشێ گول دایکی شەهید محمد حەلاق لە زیندان شەهید کرا.

٢-شەهید خاتوو شوکریە قادر حەسەن هەزار سلاو لە گیانی پاکی ئەم شێرە ژنانە لە خۆپێشاندانی ساڵی ١٩٨٢ شەهید کرا.

جگە لە مانە ی کە باسمانکردن بە سە دە ها رۆڵەی ئەم شارە بوونە قوربانی رێگای نیشتمان لە شۆرشی ئە یلول و شۆرشی نوێ ی دوای نسکۆی١٩٧٥/٣/٦.

ئەمەی جێگای داخە دەبوو مۆنەمێنتێکیان لە شوێنێکی گشتی بۆ شەهیدان دروست بکرد بایە وەک شانازیەک بۆشاری شەهیدان جگە لەمانەی کەباسمانکردن لەرۆژی راپەرینی بەهاری ١٩٩١ جارێکی دیکە پۆلێک قوربانی بەخشی لەپێناو سەرخستنی راپەرین و ئازادکردنی شاری کۆیە.

کۆیە لەشالاوی ئەنفالیش بێ بەش نەبووە چەندین رۆلە قارەمانی کەوتنە بەر ئەم شالاوە ترسناک و تراجیدیایە بەڵام لەسایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەم شارە لە هەموو روویەکەوە دواکەوتووەو پشت گوێ خراوە کەوتۆتە نێوان بەرداشی دوو لایەنی سیاسی ئەم خزمەت گوزاریانەی کەپێشکەشی کراوە کەمن لە ئاستی ئەم هەموو خوێن و قوربانی و فرمێسکە نییە کە بەخشیویەتی لەوانەی کە ئەنفال کران:

١-شەهید ئیبراهیم ئەحمەد بەگ.

٢-شەهید شێروان رەفیق حاجی کەریم.

٣-شەهید بارزان رەفیق حاجی کەریم.

٤-شەهید دلاوەر عبدالله مام یەحیا.

٥-شەهید نەوزاد صدیق شینە.

٦-شەهید وشیار حاجی رسول قۆرچی.

٧-شەهید بارزان قولە حەمەخان کاروانچی.

٨-شەهید هاورێ بکر حاجی کاکە ئەمین.

٩-شەهید عبدالخالق سلام حمدامین.

١٠-شەهید صباح صدیق محی الدین.

١١-شەهید دلسۆز محسین قادر قەپانچی.

١٢-شەهید حمدامین سماقولی.

١٣-شەهید زاهیر حمد طە.
١٤-شەهید پەخشان غەریب مستەفا.
١٥-شەهید ئاوارە ظاهر حمد طە.
١٦-شەهید کاروان ظاهر حمد طە.
١٧-شەهید تامان ظاهر حمد طە.
١٨-شەهید جەعفەر عبدالواحید.
١٩-شەهید ئەکرەم خارە حمید لەسێدارەدرا.
٢٠-شەهید جعفر کاکە اسود لەسێدارە درا.
٢١-شەهید بایز حمدامین ئاغا.
٢٢- رەهێل غەفوری، لەمانگی نیسان ١٩٨٨ ئەنفالکرا.

ئەم چوار تێکۆشەرەش لە ساڵی ١٩٧٤ دەستگیرکران لە گوندی میرسەید لە سێدارەدران.

١ -فوئاد عبدالله تۆفیق.
٢-صمد حمدامین سلام.
٣-علی عبدالله باوەقوبی.
٤ -محمد کانی مارانی.


عەیشێ گوڵ


لە لایەن هونەرمەند رەهبەر جەلال کێشراوە


حەنا یوسف تۆما


شێروان رەفیق


هەڵۆ باقی


بارزان رەفیق


شوکریە قادر


شەهید سەلیم حنا


سلیمان حەمە قاوەچی


پەیکەری شەهیدانی داستانی گوندی قورەبەرازە لە ١٩٧٩/٨/١٠


یوسف حنا عبدالکریم




ئەمەش ناوی شەهیدانی ڕاپەرینی کۆیەیە لە ١٩٩١/٣/٩

١-شەهید دلێر محمد.

٢-شەهید جوهر محمد.

٣-شەهید جەنگی ئەسعەد.

٤-شەهید جاسم فەرحان.

٥-شەهید تۆفیق حمد.

٦-شەهید پێشرەو عبدالرزاق.

٧-شەهید ئاکۆ کەریم.

٨-شەهید ئاسۆ خالد.

٩-شەهید احمد عوسمان.

١٠-شەهید ابراهیم حەسەن.

١١-شەهید کامەران حەوێز.

١٢-شەهید فیصل مجید.

١٣-شەهید عمر صالح.

١٤-شەهید صمد حمید.

١٥-شەهید شیروان اسماعیل.
١٦-شەهید سوارە عمر.
١٧-شەهید سمیرە احمد.
١٨-شەهید سعید صالح.
١٩-شەهید زرار رشید.
٢٠-شەهید نسرین صدیق.
٢١-شەهید نازەنین قەرەنی.
٢٢- شەهید نازم صالح
٢٣- شەهید میرزا فتاح
٢٤- شەهید محمد عبدالله
٢٥-شەهید محمدأمین

## زنجیرەی شەست و چوار

با ئەمجارە باسی ژن خوازی و بوک گواستنەوە بکەین لە ساڵانی سەرەتا کانی شەستەکان تاناوەراستی هەشتاکان.

جاران خێزانەکان زۆر سادەو ساکاربوون خەلکی بێ فروفێل بوو بۆیە پرۆسەی هاوسەرگیری زۆر لەئێستا سەرکەوتووتربوو جاران هەتا کچەکمان دەدیت چاومان دەچووە پشت سەرمان ژن و کچ هەموو عەباو پێچەیا ن پێوەبوو زۆرکە م دەهاتنە دەرەوە ئـە گەر مەرامت بوایە کچێک ببینی دەبوو کەمینەک یان فێڵێکت بەکاربهێنابایە.

خزمێکی نزیکم بۆی گێرامەوە گوتی ئەم خێزانەم بەهیچ شێوەیەک بۆ نەدەبینرا مەبەستم بوو بچمە داخوازی باوکم رێگای بۆدانام گوتی برۆ بازار مریشکێکی کرمانجی خۆمالی بکرە چووم کریم و هێنامەوە لای باوکم پێ ی گوتم برۆ لە ناو دەرگای ئەوان بە رەڵای بکە زەحمەت دەگیرێتەوە بەکەیفی خۆت تەماشای بکە دوایی پێیان بلێ وەرن یارمەتیم بدەن بۆ گرتنەوەی ئەوانیش دێن لەم سەرو ئەو سەر رادەوەستن سەرقال دەبن و قسە دەکەن بەم جۆرە توانیم هاوسەرگیری بکەم کە هێنام بۆم گێراوە زۆر پێ کەنی گوتی توزوانم تۆ ئەم شتەت بە دەستەوەیە بەڵام لەم سەردەمە بە هەموو شێوەیەک دەتوانی کچ ببینی لە بازار و خوێندنگاو زانکۆو ئاهەنگەکان یا بەهۆی مۆبایل و فەیسبوک جاران کورو کچ دەبوو تەمانیان لە نزیک سی ساڵی بووایە ئەوجا پرۆسەی هاوسەرگیریان پێک دەهێنا دەیان گوت قەدری یەکتر دەزانن رێز لە یەکتر دەگرن کاتێ کەکچ بە بوک دەچوون باوکی کچە دەیگوت بە مردووی دەگەرێیەوە بەمانای ئەوە دێ نە تۆرێ ی.

دایک و باوک لە کاتی کچ بە شودان هە موو دەسەلاتێکیان هەبوو بیروراییان وەردەگیرا بۆ داخوازی لەسەرەتا دوو ژنی سەر سپی بۆ ئەوکارە دەچوونە لای دایکی کچە بەبەرگوێیان هەڵدەداو بە دایکی

کچەیان دەگوت، دایکێ کچە دەیگوت جوابتان دەدەینەوە بە بوون و نەبوون داخوازی کەرەکان دەیان گوت توخوا ئەگەر نەبووە نسیب ناومان مە هێنن .

لە بابەتی ژن خواستن و بوک گواستنەوە لەلای خۆمان پاش چەند رۆژێک لە داخوازی دایکی کورە دەچۆوە لای دایکی کچە بۆ وەرگرتنەوەی وەڵام بە بوون یا بە نەبوون ئەگەر کارەکە نەبوایە دایکی کورە بە دایکی کچەی دەگوت بەردێکی لەسەردانێ کەس نەزانێ ئەگەر ببوایە ئەوە پێش چوونی پیاو دایکی کچەو کورە لە نێوان خۆیان باسی داواکاری بوکیان دەکرد داواکاری بووک زۆرکەم بوو چەند مسقالەک زێر یا زیو بوو کە بریتی بوو لە جۆتە گوارەیەک ملە گۆیەل یا سێ لولە کرمۆکە شیلان قەنەفر بەند.

ئەگەر بوک لە بنەماڵەیەکی هەبوو بخوازرابایە ئەوە کلاوو تاسی زێریان بۆ دەکرد جاران کەس داوای مالی جیای نەدەکرد دوو سێ برا لە یەک ماڵ دەژیان وەک پاشا ئێستا کیلۆ مەترێک لێک دوورن کێشەیان هەیە دوای زێر دوو دەستە کەواو کراسیان بۆ دەکرد لەگەل باولەکی بەرمیل مالی بووکیش دوو دۆشەگ و بالیف و دوو لێفیان بەگەر کچە دەدا بەتانی زۆر کەم بوو هەندێک وردە وارەی وەک سەرەویلک ودەستگرەو سەرە قۆریەو دۆخین و دەشۆرو مەسینە و چەند پارچە قوماشێک بۆ دایکی زاواو دشە کان لەگەڵ کراس بۆ باوک وبرای زاوا.

جاران خەرجی بوک زۆر کەم بوو لە هە مووی سەیرتر جاران هە ندێ کور زێریان دەخواستەوە بۆ بوک دوای چەند ما نگێک زێرەکەیان لەبوک دەستاندەوە بەڵام بوک شەرم بە خۆبوون نەیان دەهێشت کەس بزانێ لە سەرەتای بوک گواستنەوە باوک بە کچەکەی دەگوت بە کراسی سپی دەرۆی دەبێ بە بەرگی سپی بێ یەوە بە مانای بە مردوویی پێش بوک گواستنەوە پیاوان لەگەڵ مەلا دەچوون بۆ

داخوازی دوای ژنان مەلا دەیگوت هاتووین ئەم کورە بکەن بە کوری خۆتان دوایی چایەک دەخورایەوەو مارە دەکرا کور بۆی نەبوو دوای مارە کردن بچێتە ماڵ و کچە تا رۆژی گواستنەوە.

ئەگەر ماڵی بوک پێداویستی یەکیان هەبوایە ئەوە جوا بیان دەنارد وەک ئێستا نەبوو هەموو دەم زاوا بچێتە ژوور و لاقی لێ راکێشێ کچ بەهیچ شێوەیەک کوری نە دەدیت کە شوی پێدەکرد وەک ئێستا نە بوو بلێ کورەکە جوانە بالا بەرزە سەیارەو خانوو کۆمپانییای هەیە جاران کچ دەدرا بە رەوشت و پیاوی باش بۆیە پرۆسەی هاوسەر گیری سەر کەوتووبوو ئـە وەی سـەیـرە هەنـدێک بـاوک لە نـوێژی جەمـاعەتی مزگەوت کچەکەی بەمێرد دەدا بێ ئەوەی پرس بەکچ بکرێت.

شیرینی ئەوکات پاقلاوەو کێک و نەستەلەی ابو عەفیف نەبوو شەکرۆکەو لوقم بوو سەرو قلێکیان بەدەستی خۆیان لە ناو دەستمان دەنا نەوەک دوو شەکرۆکە هەلگرین لەبیرمە لەشەکراو خواردنەوەی ژن، بەرگدرووەک دەهات ناوی مام عەزیز عبدلواحید کە ناسرا بوو بە عەزیزی خەیات دەهات بە خۆی ونیو گەزێکی ئاسن و مـەقەستێک مام عەزیز قوماشەکانی لە ناو ژوورەکە بلاودەکرەوە ژنیش لە دەوروبەری مام عەزیز دادەنیشتن مام عەزیز کە لە شەکرێکی ئەبوکراوی دەهێنا رادەوەستا بە نیو گەزە ئاسنەکە کەلە شەکرەکەی دەشکاند لەسەر قوماشەکان دەیگوت پیرۆزە ژنەکانیش دەیان کرد بە کلیلی و بەزم دوایی مام عەزیز قوماشەکانی لەبن کەوش دەناو دەیبرد لە ماڵەوە کەوێ و کراس و پێداویسیتی یەکانی دەدووری مام عە زیز بەدەست جل و بەرگی دە دووری ئەوجا کە مام عەزیز دەرۆیشت دایکی بوک بە مام عەزیری دەگوت توخوا شەرارەکانی ورد بێ بە مانای تەقەرەکانی ورد بێ مـام عـەزیـزی خـوا پێـداو بە تەمەن بـوو لێـف و بـالیف و دۆشەگیشی دەدووری بۆ بوک.

ژن خواستن و بوک گواستنەوە لەلای خۆمان دوای جلک برین کە وەک شـەکراو خـواردنەوەی ئێسـتابوو پـاش چەنـد رۆژێـک بـوک

دەگوازراوە بەم شێوەیە ئەگەر ماڵی بوک نزیک بوایە بە پێ دەیان برد دوو پیاوی نزیک لە مالی زاوا لەولاو لەولا پیلیان دەگرت چونکە بوک تارای بەسەر دادەکرا کە قوماشی ئاوریشمی زەردو سورو پەمبەو سەوزبوو بەرپێی خۆی باش نەدەدیت ئەوجا خزمانی زاوا لە پشت و پێش و تە نیشتی هەلدە پەرین و سەمایان دەکردو بە چەپلە رێزان بەرەو مالی زاوا دەرۆیشتن.

جگە لەمە دەهۆل و زورناش دەکوترا لەلایەن کاک جەمال و مام عەزیز زەینەل و حەمە عەبۆ و حسێنی کوری کەبوک دەگەیشتە نزیک ماڵی زاوا گۆرانی یەکیان دەگوت و شەکرۆکەو چوکلاتیان بەسەر سەری بوک هە لدەدا دەیان گوت:

هاتینەوە هاتینەوە هەتا نەیبەین ناچینەوە

بوکمان هێنا لە دوورەوە

بوکێ مە زۆر جوانە بوکێ

بە کێشی زەردو سورەوە

بوکێ مەسەیرانە بوکێ

بوک کە دەگەیشتە ناو مالی زاوا لەسەر کورسی یەک دایان دەنا و تاراکەیان لەسەردەم و چاوی لا دەدا خزم و برادەر وردە وردە بڵاوەیان دەکرد بوک کە لە ماڵی باوکی دەهاتە دەر کابرایەک لە پێش بوک دەرۆیشت ئا وێنەیەکی گەورەی لەسەر پشت بوو هێواش هێواش دەرۆیشت ئەگەر ماڵی بوک دوربایە ئەوە بە سەیارە دەیان برد یابەسواری ئەسپ ئەو جاخەلکی دەیان گوت بردیان بە قەمەرەی کەسک و سۆر دەبوو بە هۆرن لێدان دەسرۆکە ی سوریان بادەدا زیاتر رۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە بوک دە گوازرایەوە کە بوک دەگەیشت و لەسەر کورسی دادەنرا کۆرپەیەکی گچکە ی کوریان لە ناو کۆشی بوک دادەنا بە مانای ئەوەی خودا کورت بداتێ.

ئە وەی سە یرو سەمەرەیە دوای نان خواردنی ئێوارە بوک و زاوا دەچوونە ژووری دایک و باوک و خوشکی زاوا لە بەردەرگای

ژووری بوک و زاوا دادەنیشتن چاوەڕێ ی زاوایان دەکرد بێتە دەرەوە ئەگەر زاوا درەنگ بهاتبایە دەر خزمی زاوا هاوارو دە نگە دە نگیان لێ پەیدا دەبوو دەیان گوت چ بوو خێرابە ئەوە چتکرد باوەرتان هەبێ سەریان لە بوک و زاوا دەشێواند من بەچاوی خۆم ئەم دیمە نەم دیتووە هەر سە یربوو.

برایان باسی بوک و زاوامان کرد کە دەچنە پەردەی زاوایەتی لە هەندێ لەگوندەکان کە پیاوەکە بەزاوا دە بێ و لە ژوور دێتە دەرەوە باوک و نزیکەکانی دەیکەن بە تەقەی خۆشی شتێکی دیکە ئەگەر پیاوەکە زوو مژدەی بە زاوا بوون نەدا خزم و کە س لە چاوەروانی دەبن وخە مباردەبن جاران لە گوندەکان هەندێک داب و نەریتی خراپی کچ بە شودان هەبوو وەک ژن بەژن یا گەورە بە گچکە یا شیربایی واتە لە جیاتی کچە کە برێک پارەیان وەردەگرت سوپاس بۆ خودا ئێستا نەماوە زۆرکەم هە ستی پێ دەکرێت چونکە کێشە ی زۆر بەدواوەبوو لە مە سەلەی گواستنەوەی ژن بەژن لە گوندەکان دەبوو هەر دوولابوکیان بهێنابایە شوێنێک ناوەراست بووایە لەم جێگایە دەیان گۆریەوە.

بوک لە دوای گواستنەوە تا مانگێک نە دەچوەوە مالی باوکی دەبوو دوای ئەم کاتە دووژنی نزیک لە بوک بچنە مالی زاوا پێیان بلێن بەیانی بوک دەبەینەوە باوەخوند زاوای لەگەلی نەدەهات بوکیان کە دەهێناوە دەستی باوک و براکان و دایکی ماچ دەکرد کە سەر بەرزە دوو رۆژ تا سێ رۆژ لە مالی باوکی دەمایەوە دوایی دایک و خوشکی زاوا دەهاتن دەیان بردەوە ئەوجا مالی باوکی بوک زاواو دایک و باوک و برای زاوایان دەعوەت دە کرد بۆ نانخواردنی نیوەرۆ بەم شێوەیە هاتووچوو خۆ شەویستی پەیدا دەبوو وەک ئێستا نەبوو بوک و زاوا رۆژی دوای گواستنەوە بە ژووری کەوی و بێتەوە بەراستی داب و نەریتی جاران جوان بوو پێش گواستنەوەی بوک، گیازی بوکێ رەوانەی مالی زاوا دە کرا کە بریتی بوو لە دوو سێ دۆشەگ و لێف و

بـاليف و یەک دوو بـاولی بەرمیـل شوشـــەوات و جـل و بەرگ وە ک ئێستا نەبوو بە پیکاب ئامێری کارەبایی کەل و پەلی پێ بێ بوک ئەمـە کـورتەیەک بـوو لە بـوک هێنـان و ژن و ژنخـوازی جـاران بە هیـوای سودگەیاندن بوو بێت بۆ نەوەی نوێ.



## کورتەیەک لە ژیاننامەی نووسەر



**بەندە کازم عومەر دەباغ**

لە دایک بووی ١٩٥٤/٧/١ی شارە خنجیلانەکەی کۆیەم خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیم لە هەمان شوێن تەواو کردووە. لە قۆناغی ئامادەیی پەیوەندیم بە یەکیەتی قوتابیانی کوردستان کردووە لە ساڵی خوێندنی ١٩٧١/١٩٧٠ چوومەتە زانکۆی سلێمانی /کۆلێجی ئاداب/ بەشی دیراساتی کوردی.

لە ١٩٧٤/٣/١١ پەیوەندیم کردووە بە شۆرشی ئەیلول کاتێ خوێندکاری قۆناغی سێ یەمی زانکۆی سلێمانی بووم یەکێک بووم لە برینداران بۆ مباباراندکردنی ١٩٧٤/٤/٢٤ ی شاری چەند جار شەهید قەڵادزێ ی لانکەی شۆرش لەشاری سەردەشتی کوردستانی رۆژهەلات نەشتەرگەریم بۆ ئەنجام درا دوای چاکبوونەوەم بووم بە مامۆستا لە قوتابخانەی ئاسۆس سەرەتایی کوران لە ئۆردوگای کوردە ئاوارەکان لە رەبەت لە دوای رێککەوتننامەی ١٩٧٥/٣/٦ لە نێوان سەدام حسین و شای ئێران بەناوبژی سەرۆکی جەزائیز هەواریبو مدیەن لە پلانێکی دوشمن کارانەی نێودەوڵەتی نسکۆیان بەشۆرش هێناو رەنجی چەند ساڵەی خەبات و خوێن و فرمێسکی کوردیان بەربادا لە ١٩٧٥/٣/١١ لەگەڵ هەزارەها تێکۆشەری بە شدار بوو لە شۆرشی ئەیلول خۆمان بە ناچاری لە دارە شمانەی سەر بە شاری قەلادزێ رادەستی حکومەتی ئەوسا کردەوە چونکە لێبوردنی گشتی راگەیاندرابوو لەلایەن بەعسی یەکان لە دوای دوو رۆژ مانەوەمان هەر کەسە گەراینەوە بۆ سەر کاری پێشووی خۆمان بەندەش پەیوەندی بە زانکۆی سلێمانیەوە کرد بەردەوام بووم لە خوێندن. لەساڵی خوێندنی ١٩٧٥/ ١٩٧٦ ز بروانامەی بەکالۆریۆسم وەرگرت لە هەمان ساڵ بە

مامۆستای سەرەتایی دامەزرام لەگوندی روست سەر بەقەزای چۆمان چونکە یەکێک بووم لە گەراوەکانی دوای نسکۆی شۆرشی ئەیلول لە دوای راگواستنی گوندەکان لە ساڵی ١٩٧٧ گوازرامەوە بۆ گوندی گەرموک /ساتو قەڵا دوایی گوازرامەوە بۆ گوندی هەواوانی سەرێ سەر بە شاری کۆیە دوای چۆلکردنی گوندەکانی دەشتی کۆیە لەساڵی ١٩٨٤ گوازرامەوە قوتابخانەی چوارباغ لەناو کۆیە.

لەساڵی ١٩٨٥ مووچەم راگیراو فەرمانی گرتنمان بۆ دەرچوو دەر بەدەر بووین بۆ هەولێر لەم شارە خۆمان شاردەوە ماوەیەکی زۆر کاری کرێکاریم دەکرد لە باڵەخانەی شیراتۆن تا راپەرین دوای راپەرین گەرامەوە بووم بە بەرێوەبەری قوتابخانەی فیدرالی لە گەرەکی مفتی/هەولێر لە ١٩٩٣/٣/١ بووم بە سەرپەرشتیاری کارگێری لە لایەن بەرەی کوردستانی لە دوای ١٩٩٦/٨/٣١ جارێکی دیکە لە کاری سەر پەرشتیاری دوور خرامەوە بەهۆی بیرو رای جیاواز لە لایەن لایەنێکی سیاسی دەسەڵاتدار گەرامەوە قوتابخانەی فیدرالی بە مامۆستا لە دوای ئاشت بوونەوەو تێکەل بوونەوەی دوو ئیدارەیی لە ساڵی ٢٠٠٦ جارێکی دیکە گەرامەوە بۆ پیشەی سەرپەرشتیاری لە پەروەردەی هەولێر بەردەوام بووم تا خانەنشیین بوونم لە ٢٠١٧/٧/١.

لە ساڵی ١٩٧٣ تا ئێستا کاری رۆژنامە نووسی دەکەم ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامە نووسانی کوردستانم.

بەداخەوە لە ژیانی وەزیفی زۆر ناخۆشیم دیت جگە لە هەموو ئەوانە ئەندامی لیژنەی ئیدارەی کۆمەڵەی هەرەوەزی نیشتەجێکردنی /هەولێر بووم لە ١٩٩٢/١٠/٢٧ تاوەکو ٢٠١٤/١٠/٢٧ لەهەڵبژاردنێکی دیموکراسیانە ئەمەی گرنگە هەر کارێکم کردبێ بە دلسۆزی و بە پاکی جێم هێشتووە بە شاهیدی هەموو ئەو کەس و لایەنانەی کە شارەزایەتیان هەیە لەگەڵمدا ئێستا بەناونیشانی سەر پەرشتیاری پسپۆری خانەنشین بووم سەر بەرزم کە هەمیشە لە سەنگەری میللەتەکەم بووم بێ دابران هەر بۆیە لە ١٩٨٠ /ز پەیوەندیم

بەرێکخستنەکانی بزوتنەوەی سۆشیالستی کوردستان کردووە وەک باڵێکی ناو یەکیەتی نیشتمانی کوردستان لە رۆژە سەختەکانی خەبات.

هیوام لە ژیان دەست کەوت نەبووە چونکە پێویستیم بە زیاتر نی یە لەوەی کە هەم بووە بەڵکو هەمیشە لە خەمی یەکریزی ناو ماڵی کورد بوومە لە هەر چوار پارچەی کوردستانی زۆر لێکراو

**بەکردەوە دەی سەلمێنم عاشقی کوردستانم**
**تەنها سەر بەرزیم دەوێ بۆ گەل و نیشتمانم**

"کازم دەباغ"

سوپاس و پێزانینم بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە یارمەتیان داوم بۆ بەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبە جوانە. بەتایبەتی د. دابان کازم دەباغ و کاک یوسف ئەبوبەکر.

هیوادارم توانیبێتم لەرێگای ئەم کتێبە خزمەتێک بە شاری کۆیە بکەم، داوای لێبورنیش دەکەم لە هەر کەموکورییەک.